**فێربوونی وێنەی**

**ببینەو ... ئەنجامبدە ... !!**

# ویندۆز ئێکس پی

Microsoft

# Windows XP

***هێمن مەلا کەریم بەرزنجی***

***dr.hemnbarznji@yahoo.com***

***dr.hemn@yahoo.com***

**بێدەنگی لە چەنەبازەوە فێربووم و...هەوڵدان لە تەمەڵەوەو...هێمنی لە لوت بەرزەوە ...زۆر سەیرە من ڕێزی ئەم مامۆستایانەم ناگرم...!!**

**(جۆزێف جۆبێر)**

**ئەم بەرهەمە پێشکەشە بە:-**

- هەموو ئەوانەی گەڕیدەی نوێترین تەکنەلۆژیای سەردەمن.
- هەموو ئەوانەی بۆ ساتێکیش بێت خۆشم ویستوون، بەتایبەت هاوڕێکانم.
- هەموو ئەوانەی بە نیگایەکیش بێت ئەوینم بۆیان هەبووە. بە تایبەت: هاوژین- شادە- لەرێ.
- هەموو ئەو مامۆستایانەی فێریان کردم چۆن پێبگەم بە تایبەت سۆران نەریمان، د. محمد خضر، د. محسین ابو بکر محمد.



**خوێنەری هێژا** ... زانست خوازی خۆشەویست تکایە هەر سەرنج و تێبینیەکت هەبوو لەسەر ئەم کتێبە، یان هەر کتێبێکی دیکەی نووسەر، یان شتێکت لا ڕوون نەبوو ویستت باشتر تێبگەیت و زانیاری زیاترت دەست بکەوێت ... بەهۆی یەکێك لەم ڕێگایانەوە پەیوەندیم پێوە بگرە:-

E-Mail:- hemn_ barznji@Yahoo.com
Mobile:- ٠٧٧٠١٥١٥٥٨٢

**کتێبی: ویندۆس ئێکس پی ... بۆ سەرەتایی و ناوەندی.**

**دانان و ئامادەکردنی: هێمن مەلا کەریم بەرزنجی**

**ساڵی: ٢٠٠٦**

**پیت چنین: جوان شابان چنگیانی**

**نەخشەسازی ناوەوە:ڕۆژا زەبیحی**

**تیراژ: ٢٠٠٠ دانە**

**چاپخانەی:ئارام**

**ژمارەی سپاردنی ( ٨٢٧ )ی ساڵی (٢٠٠٥)ی دراوەتێ.**

**پانزەهەمین بەرهەمی کتێبی نووسەر**

# وتەیەك:-

نـویٚترین تەکنـەلۆژیای سـەردەم کـە کۆمپیوتـەرو بەشـە پەیوەندیـدارەکانی گرنگترینیانـە، پێویـستیەیەکی هەنووکـەیی ژیـانی هـەر تاکێکـە تـا دەگاتـە خێـزان و، دام و دەزگـاو، دامەزراوەکانی حکومەت و، ئەهلیەیەکانیش.

دیـارە ئـەوەی وایکـردووە کۆمپیوتـەر ببێتـە بەشـێکی گـرنگ لـەژیان کارئاسـانی کردنـی ئـەم ئامێرەیە بۆ ئەوەی جەستەو مێشکی مرۆڤ ماندوو نەبێت، بە جۆرێك کە هەموو ئەو بیردۆزو قسە ناڕاستانە ڕەتدەکاتـەوە کـە پێیـان وایـە کۆمپیوتـەر هۆکارێکـە بـۆ تەمبـەڵی و، دابـەزینی ئاسـتی بیرکردنـەوە، بـەجۆرێك کـە ئـەم خـاوەن قـسەو بیردۆزانـە ڕێگریـان لـە بـەکارهێنانی ئامێرەکانی ژماردن (حاسیبە) دەکرد، وەك ئەوەی هەنووکە جیللی کۆن ڕێگری لە نەوەی نویٚ دەکات بۆ بەکارهێنانی کۆمپیوتەرو حاسیبە لە تاقیکردنەوەکاندا بە بیانوی ناجۆرو نادروست، کە بیانـەویٚ یان نا، ئـەمڕۆ بێت یان سبەی، دەبێت ئەو بۆچوونە بۆگـەن و، دوواکەوتووانەیـە لەگۆڕ بنرێت. چونکە دەبێتە هۆی وەستاندنی ڕەوڕەوەی زانست، یان: لانی کەم خاوکردنەوەی ڕەوڕەوەی زانست بۆیـە بـە پێویستی دەزانم ئەوەنـدەی توانـام بەسـەریدا دەشکێت لـەم زانستە فراوانە بدوێم و، هەرجارەی بەرنامەیەکی شی بکەمەوەو، شەرحی بکـەم، لەسـەرەتادا بـۆ ئاسـتی سـەرەتایی و ناوەنـدی و پاشـان فراوانـی بکـەم و، قوڵتری بکەمـەوە بـۆ ئـەوەی هەرسـیٚ ئاسـتی: سـەرەتایی- ناوەنـدو پێـشکەوتوو بـەکاری بهێـنن و، سـودی لێـوەربگرن. وە لەگـەڵ ئەوەشـدا هەوڵدەدەم کەلەسەر نوێترین ڤێرژنی بەرنامەکان، یان ڤێرژنی کۆن ونـویٚ پێکـەوە بـدوێم، ئەگـەر ڤێرژنـی نـویٚ لەبەردەسـتدا بێـت. چـونکە بێگومـان ڤێرژنـە نویٚیـەکان زیـاتر بەسـودن و پێشکەوتووترن تەنانـەت ئەگـەر لـە کورتکردنـەوەی خەتەواتەکانیـشدا بێـت. بۆیـە بـەڵێن بـەتۆی زانست خواز دەدەم کە لە سەرەتای ساڵی نویٚ و بە بڵاوبوونەوەو، پەرەسەندنی ویندۆی نوێی کۆمپانیای مایکرۆسۆفت بەناوی (ویندۆی ڤیستا) شی بکەمەوەو کتێبی لەسەر بنووسم.

وەلیٚ بڵاوبوونـەوەی ڤێرژنـی نـوێی بەرنامـەکان بەداخـەوە لای ئێمـە زۆری پێدەچـێت، بـەهۆی نەبوونی زانیاری و توانای کەسـەکانەوە بەشـێوەیەك کـە هەنووکـە لـەزۆر شـوێن ئۆفیـسی ٩٧ و ویندۆی ٩٨ و ویندۆی می ( Me ) و شتی لـەوجۆرە دەبینم وە تاڕادەیـەك وینـدۆی ئێکس پـی بەربڵاوەو خەڵکێکی باش کـاری پێدەکات بۆیـە ئـەم ویندۆیـەم هەڵبـژارد... تـا کتێبـی ئاییندەی نووسەر لەسەر ویندۆی ڤیستا بە سەلامەت .. چاوەڕێی: مایکرۆسۆفت ویندۆز ڤیستا بن .. لە ئاییندەدا بە چاپ دەگات.

# کارپێکردنی Windows XP

بۆ کارپێکردنی بەرنامەی ویندۆسی ئێکس پی ( windows XP ) پە نجە دەنێین بە دوگمەی ( power )ی سەر کەیسە ( case )کەدا، کە ئەم دوگمەی پاوەرە ئامادەیە بە یەکەی بنچینەیی کۆمپیوتەرەوە. CPU

یان وەك لەناو بەکارهێنەرانی کۆمپیوتەردا باوە، دەڵێین: کۆمپیوتەرەکە دادەگیرسێنین و، کەمێك چاوەڕێ دەکەین تا بەرنامەکە چالاك دەبێت و ئەم شێوەیەی خوارەوە دەردەکەوێت :




ئەم شێوە کراوەیەی سەرەوە بەڕووی شاشە ( Desktop ) ناودەبرێت کە ڕێکخستنی سەرەتای کارەکانی کۆمپیوتەرو، خەزنکردن و فایلەکان لەڕووی شاشەدا دەبێت و، وە هەموو ئەو ئامرازانەی لەسەرە کە بەکارهێنانی خزمەت گوزارییان زۆرە، بەم شێوەیە :-

١- My computer :- ئەم بەشە زۆربەی فەرمانە گرنگەکانی کۆمپیوتەری تیادایەو بۆ ناساندنی مەلەفە سەیڤکراوەکانیش سودی تەواوی هەیە، کە دوواتر بە ووردی باسی دەکەین.

٢- Internet explorer :- ئەم بەشە بەرنامەی لا پەڕەکانی ئینتەرنێتە کە بەهۆیەوە دەتوانین داغڵ بە تۆڕەکان ببین و، لا پەڕەکان ببینین و، ماڵپەڕە جیاوازەکان بکەینەوە.

٣- Recycle Bin :- ئەم بەشە بە تەنەکە خۆڵ، یان زبڵدانی کۆمپیوتەر ناسراوە لای بەکارهێنەرانی کۆمپیوتەرو هەموو ئەو بابەت و فۆڵدەرانەی دەیان سڕینەوە.

٤-my network :- بەشی پەیوەندیدار بە تۆڕەکان.

٥-my document :بەشی دۆکیۆمێنتەکانم ،کە پەیوەندیدارە بە دوکیۆمێنت و فایلە خەزنکراوەکان.

٦-هەموو ئەو فایل و فوڵدەرانەی خۆمان لەسەر دیسك تۆپ داین دەنێین و خەزنیان دەکەین.

جگە لەم شەش خاڵەی سەرەوە کە گرنگترینیانە چەندین ئایکۆنی Icon دیکە لەسەر Desktop دەبینرێت و کردنەوەی هەر پە نجەرەیەکیان ،لەسەر ئەم ڕووی شاشەیە دەردەکەوێت، وە بە گوێرەی پێویست دەتوانرێت ئەم بەشانەی سەر ڕووی شاشەکە زیادو کەم بکرێت و دەتوانرێت ئەو فایل و کارانەی ڕۆژانە دەیکەین لەسەر ڕووی ئەم شاشەیە سەیڤ save بکەین بۆ کارئاسانی و بۆ ئەوەی لەبەر دەستدا بێت،یان لە هاردو لۆکەیشنی دیکەدا خەزنی بکەین بەلاَم شۆتکەتی بۆ دروست بکەین لەسەر ئەم ڕووی شاشەیە.

چەند فەرمانێکی دیکە لەسەر بەشێکی دیاریکراوی desktop دەبینرێت و بۆ کارئاسانی سودیان لێوەردەگیرێت، کە بەم بەشەی دیسک تۆپ desktop دەڵێین: تاسك باڕ Task bar کە ئەمە وێنەکەیەتی:




لەسەر ئەم بەشەی دیسك تۆپ کە بە Task bar ناسراوە بەشێوەیەکی گشتی ئەم ئامرازانە دەبینرێت، کە لێرەدا تەنها ئاماژە بە ناوەکانیان دەکەین و لەبەشەکانی تردا بە دوورو درێژی باسیان دەکەین،وە دەتوانین ئەم ئایکۆنانە کەم و زیاد پێبکەین ،بە گوێرەی پێویستی کارکردن بە کۆمپیوتەرەکەمان ،کە بەگوێرەی پێویست باسی چۆنییەتی ئەم زیادکردن و کەمکردنە دەکەین:

١- کات ژمێر

٢- رۆژمێر

٣- ئایکۆنی گۆڕینی زمانی کارکردنی کۆمپیوتەرەکە.

٤-دووگمەی تۆڕی پەیوەندییەکان.

٥-دووگمەی ڤۆلیۆم volume

٦-Windows security / alerts

٧-دووگمەی ئەو ئەنتی ڤایرۆسەی داتبەزاندووە.

جگە لەم چەند بەشە بەشی دیکەی گرنگ دەبینرێت کە سەرەکی ترینیان دوگمەی سەرەتای دەستپێکردنە Start کە بەشە گرنگەکانی لێوە چالاك دەکرێت بەهۆی کلیك کردنەوە لەسەری، کە ئەم بەشە گرنگانە بەشێوەی لیستێك بەناوی Task Menu دەردەکەوێت کە ئەم لیستە رێگەی کارپێکردنی بەرنامەکانە، وە گەڕان بۆ فایلەکان و، زۆر شتی تر.

کە لە دواتردا بەگوێرەی پێویست لەسەر هەریەك لەم بەشانەی ناومان هێنان دەدوێین و بە نموونە هەریەکەیان ڕووندەکەینەوە.

## ماوس Mouse ... و چۆنیەتی بەکارهێنانی:-

ئامێرێکی بچووکی گەیەنراوە بە یەکەی بیری سەرەکی (CPU= Central Processing Unit) کە کاری ئاماژە دانە بە فەرمان و ئامرازەکانی ڕووی شاشە Desktop.

بە جوڵاندنی ئەم ئامێرە سەهمێکی بچووك لەسەر ڕووی شاشەکە Desktop دەجوڵێت، بەگوێرەی جوڵاندنی دەسکی بەکاربەر.

لەڕاستیدا دروست گرتنی ماوس لەلایەن بەکاربەری کۆمپیوتەرەوە بەم شێوەیە دەبێت:



که دانانی پە نجەی شایەتوومان لەسەر بەشی چە پی لاشەی ماوسەکەیەو بـە پە نجـەنان پیایـدا دەڵـێن: Click و بـە پە نجـەنان بـە بەشی ڕاستی ئامێرەکەدا کە پە نجەی تەنیشت پە نجەی شایەتوومانی بە سەرەوەیە و سێ پە نجـەی دیکـەش بـەملاولای ئامێرەکەوەیـە، دەڵێن: کلیکی ڕاست Right click .

ئاماژەدان بەهۆی هێمای ( سەهمی ) ماوسەکەوە بۆسەر هەریەك لە فەرمان و ئامڕازو بەشەکان جیاواز نابێت لەنێوان کلیك وکلیکـی ڕاسـت و بە هەردووکیان کارکردن لەسەریان بە ئە نجام دەگات بێ جیاوازی، کە دوواتر ڕوونـی دەکەینـەوە بـە نموونـەی پێویـستەوە. جگـە لـە جێگرتنەوەی فەرمانەکان و ئە نجامدانی زۆربەی کارەکـان بـەهۆی هـەردوو کلیـك و کلیکـی ڕاسـتەوە بـێ جیاوازییـەکی دیـارو بەرچـاو، دەتوانین بڵێین کە ماوس ئەم بەکارهێنـانەی خوارەوەی هەیە :-

١- کلیك click :- بە پە نجەنان لەسەر بەشی چە پی ماوسەکە دەوترێت کە ماوەی کارکردنی فراوانـەو لـەزۆر کـات و شـوێنی جیـاوازدا بەکاردەهێنرێت و ئەم کرتە کلیك کردنە بەشێوەیەکی خێرا دەبێت لەسەر ئەو فەرمانەی دەمانەوێت.

٢- Right click :- بە پە نجەنان و کرتەکردن لەسەر بەشی ڕاستی ماوسەکە دەوترێـت کـە لەسـەر هـەر بەشـێکی شاشـەکە ئـە نجام بدرێت جیاوازی نیيەو بۆ بە جێگەیاندنی فەرمانەکان سوودی لێوەردەگیرێت کە لە نموونەو کارەکانی ناوەوەدا زیاتر ڕووندەبێتەوە.

٣- Double click :- دووانە کلیك یان دووانە کرتە بە دووجار پە نجەنانی بەردەوام بەکلیکی چە پدا دەگوترێـت کـە بەشـێوەیەکی خێراو بێ پچڕان دەبێت. بە زۆری بۆ کردنەوەی بەرنامەو فوڵدەرو بەشەکانی ڕووی شاشە Desktop بەکاردەهێنرێت.

٤- Drag and Drop :- مەبەست لەم فەرمانەی ماوس کلیك کردنە لەسەر ئایکۆنێك یان بەشێك و هەڵگرتنی ئـەو ئـایکۆن و بەشـە بەهۆی پە نجەنان بە کلیکی چە پدا بەشێوەیەکی بەردەوام و بێ دەست لابردن لەسەری هەتـاوەکو ئەوکاتـەی ئـایکۆن و بەشـەکە دەبەینـە ئەو شوێنەی کە مەبەستمانە، دەوترێت کە ئەم کارەش بەزۆری بۆ جوڵاندنی ئامرازەکان و پە نجەرەکان بەکاردەهێنرێت لەسەر شاشەکە.



# دەرچوون لە بەرنامەی Windows XP

**دەرچوون لە بەرنامەی ویندۆوس ئێکس پی، یان داخستنی بەرنامەکە کارێکی پێویستە. چونکە هەڵەیەکی گەورەو کوشندەیە ئەگەر ئامێری کۆمپیوتەرەکە ڕاستەوخۆ بکوژێنینەوەو بەرنامەی مایکرۆسۆفت و ویندۆ ئێکس پی** windows XP **لەباری کارکردندا بێت لەبەرئەوەی پێدەچێت زیان بە بەرنامەی ویندۆس** windows **بگات و خراپ ببێت.**

**لەبەرئەوە پێویستە لەبەرنامەکە دەربچیت بەر لە کوژاندنەوەی ڕاستەوخۆی ئامێری ئەلکترۆنی کۆمپیوتەر بەم شێوەیەو بەجێبەجێکردنی ئەم هەنگاوانەی خوارەوە:-**

**١- بە جوڵاندنی ئامێری ماوسەکە سەهمی سەر ڕووی شاشەکە** Desktop **ببەرە سەر دوگمەی دەستپێکردن** Start **لەبەشی** Task Bar
.

**٢- کلیك لەسەر دوگمەی** Start **( دەستپێکردن ) بکە بۆ ئەوەی لیستی (** Task menu **) بکرێتەوەو چالاك ببێت.**

**٣- بە جوڵاندنی ئامێری ماوسەکە سەهمی ماوسەکە ببەرە سەر بەشی** Turn off Computer **لە لیستی** Task menu **کە لە خاڵی ( ٢ )دا کردمانەوەو پاشان کلیکی لەسەر بکە.**




**٤- دەبینین پە نجەرەیەکمان بۆ دەکرێتەوە کە بریتییە لە ویندۆی** Turn off Computer **وەك لە وێنەکەدا دیارە.**




**٥- دەچینە سەر بەشی** Turn off **و کلیکی لەسەر دەکەین، بەم شێوەیە بەرنامەکەمان بۆ دادەخرێتەوەو لێی دەردەچین.**

* سەرنجـــــــــــــ١ـــــــــــــ:-

بۆ کارئاسانی و کورتکردنەوەی هەنگاوەکان دەتوانین ئەو پێنج خاڵەی سەرەوە بەهۆی کلیکی ( Alt+F٤ ) وە ئە نجامبدەین.




سەرنجـــــــــــ ٢ ـــــــــــ:

دوگمەی re start کە دەکەوێتە تەنیشت دوگمەی turn off بۆ دووبارە دەستکردنەوە بەکارکردن بەکار دەهێنرێت، ئەمەش لەهەندێك باردا دەبێت وەك جامبوونی کۆمپیوتەرەکەت، کە هاوکات دەتوانی ئەم کارە بەهۆی دوگمە بچوکەکەی سەر کەیسەکەشەوە بەئە نجام بگەیەنیت.

سەرنجـــــــــــ ٣ـ ـــــــــــ:

دوگمی stand by بۆ وەستانی کاتی کۆمپیوتەر بەکار دەهێنرێت کە بەهۆی جولاّندنی ماوسەکەوە، یان هەربەشێکە کیبۆرد دەگەڕێینەوە بۆ هەمان باری ئاسای کارکردن بۆ هەمان ئەو شوێنەی کە تیایدا فەرمانەکەمان تیا بەجێهێنا، واتە گەر بەرنامەش کرابێتەوە داناخرێتەوە و وەك خۆی دەمێنێتەوە و، ئێستا بۆ دەستپێکرنەوەی کلیك لەسەر ناوی بەکارهێنەری ئامێرەکە( To begin, click your user name)بکە.



# بەشی دووەم / ئیشکردن لەسەر پە نجەرەکان

## ١-کردنەوەی پە نجەرەکان

وەك لەبەشی یەکەمداو لەناساندنی بەرنامەی ویندۆسدا باسمانکرد لەسەر ڕووی شاشەی Desktop کۆمەڵێك Icon ( ئایکۆن ) هەیە، کە هێمای بەرنامەو بەشە گرنگەکانی کۆمپیوتەرەو کورتکراوەی بڕدراو ( Shortcut )ی بەرنامەو بەشە گرنگەکانەو، لەم بەشی دووەمدا باسی چۆنیەتی کارکردن لەسەر ئەم بەرنامەو بەشانە دەکەین، هەر لە کردنەوەو داخستنیان و گەورەکردن و بچووککردنەوەیان و هەندێك زانیاری دیکەی پەیوەندیدار پێیانەوە. بۆ ڕوونکردنەوەو ئە نجامدانی ئەم کارانەی باسمانکرد بەشی My Computer هەڵدەبژێرین وکاری لەسەر دەکەین.

بۆ کردنەوەو چالاککردنی My Computer ئەم هەنگاوانەی خوارەوە هەڵدەگرین :-

١- سەهمی ماوسەکە دەبەینە سەر بەشی My Computer لەسەر ڕووی شاشەکە Desktop .

٢- پێویستە بەشێوەیەکی خێراو دوابەدوا، دووانە کلیکی چەپ لەسەر My Computer بکەین. واتە : Double click بۆ ئەوەی بۆمان بکرێتەوەو بێتە سەر ڕووی شاشەکەو چالاکبێت.




یان : دەتوانین ئەو کارەی سەرەوە بەهۆی کلیکی ڕاستەوە ئە نجامبدەین بەم شێوەیە :-

* دوای ئەوەی سەهمی ماوسەکەمان بردەسەر My Computer لەسەر ڕووی شاشەکە Desk top.

* کلیکی ڕاستی Right click لەسەر دەکەین و دەبینین لیستێکمان بۆ دەکرێتەوەو سەهمی ماوسەکە دەبەینە سەر بەشی کردنەوەی Open ئەو لیستەی بۆمانکراوەتەوە.




سەرنجـــــــــــ١ـــــــــ:

* دەتوانین لە جیاتی ئەوەی كلیك لەسەر openبكەین ،كلیك لەسەر exploreبكەین ،كە هـەمان كارمـان بـۆ دەكـات تـەنها جیـاوازی لەوەدا دەبێت كـە لـە جیـاتی ئـەوەی لەبەشـی چـە پدا بەشـەكانیsystem taskو other place وdetail-ت،بـۆ بكاتەوە،بەشـی folders-ت ،بۆ دەكاتەوە.






هەرکام لەو دوو ڕێگەیەی سەرەوە بێت جیاوازی نییەو (My Computer)مان بۆدەکرێتەوە، بەم شێوەیە :-




* سەرنج ــــــــــ٢ــــــــــ :-

١- ئەم کارە بەتەنها کردنەوەی My Computer و هیچی تر. وە باسکردنی بەشەکانی جێ دێڵین بۆ شوێنێکی تر.

٢- کردنەوەی My Computer جگە لەو دوو ڕێگەیەی سەرەوە، واتە : بەهۆی (click , Right click) ەوە، دەتوانین بەهۆی کیبۆردەکەوەو بەشێوەیەکی ئاسان و بۆ کورتکردنەوەی هەنگاوەکان بە پەنجە داگرتن لەسەر هێمای ویندۆس



و پاشان پەنجەنان بە پیتی E دا بێ ئەوەی پەنجە لەسەر هێمای ویندۆس لاببەین، واتە : لە پێشدا پەنجە دەنێین بەهێمای ویندۆسداو پاشانیش پیتی E ئەنجامبدەین، ئەوا : دەبینین پەنجەرەی (ویندۆی) My Computer مان بۆ دەکرێتەوە.

سەرنجــــــ٣ـــــــــــ:
ئەو دوو ڕێگەیەی لە سەرەوە بـەکارمان هێنـا بـۆ کردنـەوەی my computer بـۆ کردنـەوەی هـەر دووگمـەو ئـایکۆنێکی تـریش بـەکار دەهێنرێت بێجیاوازی ، جا ئەو ئایکۆنە : فۆڵدەربێت ، یان شۆرت کەتو شتی تر.

## ٢-داخستنی پە نجەرەکان :

Close:-

فەرمانی داخستن بۆ لابردن و داخستنی ویندۆکە بەکاردەبرێت و بە کلیك کردنی ئەم کارە ڕوودەدات و پە نجەرەکە دادەخرێتـەوەو لەسـەر رووی شاشەکە لادەچێت و چالاك نابێت.




* سەرنجــــــ١ـــــــــــ:-
فەرمانی داخستن Close بەهۆی دوگمەکانی سەر کیبۆردەکەشەوە بەئە نجام دەگـات و هـەنگاوێکی ئاسـانترو کـورت تریشەو تـەنها بـە پە نجەنان بە هەردوو کلیکی F+Alt پێکەوە بەئە نجام دەگات.

سەرنجــــــ٢ـــــــــــ:
هەموو بەرنامەیەك، یان پە نجەرەیەکی سەرەکی دووگمەیەکی تایبـەتی هەیـە بەداخسـتنی ئـەو پە نجەرەیـە، یان بەرنامەیە، لێرەشدا دەکەوێتە لیستی file-وەو ، بریتیە لە دوگمەی فەرمانی close.

File>>>>>>>close (in menu bar of windows/my computer)

سەرنجــــــ٣ـــــــــــ:
وەك چۆن هەنگاوەکانی کردنەوەی پە نجەرەکان هەموو پە نجـەرەکانی گرتـەوە بێجیـاوازی، دیـارە مەبەسـتمان لـە ئایکۆنـەکانی سـەر شاشەوە هەندێك ئایکۆنی دیکەیە، وەك ناوەڕۆکی my computerئاوەهاش هەنگاو شێوەکانی داختنی بەرنامەو پە نجەرەکان وەك یەکە، وەك لەسەرەوە باسمانکرد...........!!

# بەشی سێهەم

# My Computer

وەك دەزانین هەموو پە نجەرەكانی بەرنامەو بەشەكانی كۆمپیوتەر كۆمەڵێك كارو چالاكییان لەسەر ئە نجامدەدرێت كە هاوبەشە لەنێوانیانداو گۆڕانی بەسەردا نایەت، وەلێ ناچاریش دەبین كە لە هەموو بەش و كتێبێكدا باسیان بكەین بۆ ئەوەی خوێنەرو بەكارهێنەری كتێبەكانم ماندوو نەكەم و نەیانگێڕمەوە بۆ ئەو بەشانەی كە تیایدا باسكراوە. چونكە ئەم كتێبە هەموو نەوەو تەمەنێك بەكاری دەهێنێت و، بۆ منالان بەتایبەتی شیاو نی یە كە بە شوێن ئەو زانیارییانەدا بگەڕێن.

وەئەوەی جێگەی سەرنجە هەموو بەرهەمەكانی من بەشێوەی نەزمی نوێی فێركردنی جیهانی یە كە دەڵێت: "ببینەو ئە نجامبدە" و ئەم شێوە نوێ یە كە عەرەبەكان بە (تعلم الصوری) ناوی دەبەن و ئینگلیزەكانیش بە : "زمانی فێركردنی وێنەیی جیهانی بێ گرێ و گۆڵ بۆ هەموو تەمەن و ئاستە جیاوازەكان و زمان ناسان و زمان زانان و ئاستە جیاوازەكانی خوێندن" پێناسەی دەكەن باشترین ڕێگەی فێركاری یەو بە (زمانی وێنە) ناوی دەهێنن و، هەندێكیان پێیان وایە دەبێتە زمانی دووەمی جیهانی دوای زمانی مۆسیقا كە بە تاكە زمان دادەنرێت بۆ هەموو گەل و نەتەوەو زمانە جیاوازەكان.

## یەكەم :كردنەوەی my computer:

١-سەهمی ماوسەكە ببەرە سەر ئایكۆنی my computerو دووانە كلیكی لەسەر بكە،و دەبینین پە نجەرەی مای كۆمپیوتەرمان بۆ دەكرێتەوە ،وەك پێشتریش باسمانكردووە.

٢-یان دەتوانیت ئەم ڕێگەی دووەمە بەكار بهێنیت ئەویش بە كلیكی ڕاست كردن لەسەر ئایكۆنی my computerی سەر ڕووی شاشەكەو پاشان كلیك كردن لە سەر openلە و لیستەنوێیەی بۆمان دەكرێتەوە.سەرنج:دەتوانین لە جیاتی ئەوەی كلیك لەسەر openبكەین ،سەهمە ماوسەكە بهێنینە سەر exploreو كلیكی لەسەر بكەین،كە هەمان كار دەكات بەكەمێك جیاوازییەوە ،كە پێشترو لەبەشی دوودا باسمان كرد.



## دووەم: پێکهاتەی گشتی My Computer و کارکردن لەسەری:

**یەکەم:- شریتی ناونیشان Title bar :-**

دوای کردنەوەی My Computer و چالاکبوون و هاتنە سەر شاشەی لەبەشی سەرەوەیدا شریتێك دەبینین کە بە شریتی ناونیشان ناسراوە Title bar چونکە ناونیشانی پەنجەرەکەی تیادایەو لەلای چەپیدا نووسراوە My Computer و بەکارهێنەر بەمە دەزانێت کە ئەو پەنجەرەیەی کراوەتەوە چییە..؟! بڕوانە وێنەکە.




وە هەر لەم بەشی (Title bar)ەدا سێ دوگمەمان هەیە کە هەریەکەو بەکارهێنانێکی هەیە بەم شێوەیە:-

١- Minimize :-

بە کلیك کردن لەسەر ئەم دوگمەیە پەنجەرەی My Computer بچووك دەبێتەوەو لەسەر ڕووی شاشەکە Desktop لادەچێت و لەسەر بەشی Task bar و لەخوارەوەی شاشەکە بەشێوەیەکی بچووککراوەیی دەردەکەوێت، بەم شێوەیە:-@@ وە بەکلیك کردن لەسەر ئەم بەشە بچووککراوەیە، پەنجەرەی My Computer دەگەڕێتەوە بۆ سنووری شاشەکەو وەك سەرەتای کردنەوەکەی لێدێتەوەو دەردەکەوێتەوە.

* سەرنج:-

بەجێگەیاندنی فرمانی (Minimize)و بچووککردنەوەی پەنجەرەی چالاکی سەر ڕووی شاشەکە بۆسەر بەشی خوارەوەی شاشە Task bar بەهۆی کیبۆردیشەوە دەبێت، بە پەنجەنان بە کلیلی ویندۆس وە پاشان پەنجەنان بە پیتی (D)دا پێکەوە، بەڵام بە مەرجێك تەنها پەنجەرەیەك کرابێتەوەو چالاك بێت و کاری تیا بکرێت.

٢- Maximize :-

ئەم دوگمەیە بەکاردەهێنرێت بۆ گەورە کردن و بچووککردنەوەی پەنجەرەی چالاك لەسنووری ڕووی شاشەکە Desktopدا، بەکلیك کردنی ئەمکارە بە ئە نجامدەگات.

وە لەکاتی بچووککردنەوەی پەنجەرەکەدا هێماکە دەگۆڕێت و فەرمانەکە دەبێتە Restore واتە دەتوانین بەهۆیەوە (ڕی- ستۆر/ re-store)ی بەرنامەکە بکەین و بیگێڕینەوە بۆ حەجم و شێوەی پێشووی.

* سەرنج:-

دەتوانین ئەو فەرمانەی سەرەوە بەهۆی دووانە کلیك کردنەوە Double click بە ئە نجام بگەیەنین کە ئەم دەبڵ کلیکە لەسەر شوێنێکی چۆڵی سەر شریتی ناونیشانە (Title bar)ەوە دەبێت بەم شێوەیەش پەنجەرەکە بچووك دەبێتەوە لە سنووری شاشەکەداو بە دووبارە دەبڵ کلیك کردنەوە لەسەر شوێنێکی بەتاڵی سەر ڕووی شریتی ناونیشان دەگەڕێتەوە بۆ حەجم و شێوەی پێشووی بێ ئەوەی پێویست بە بەکارهێنان و Maximize, Restore بکات.

٣- Close :-

فەرمانی داخستن بۆ لابردن و داخستنی ویندۆکە بەکاردەبرێت و بە کلیك کردنی ئەم کارە ڕوودەدات و پەنجەرەکە دادەخرێتەوەو لەسەر ڕووی شاشەکە لادەچێت و چالاك نابێت.

بەڵام ئەم کارە مەکەو پەنجەرەکە دامەخە بۆئەوەی ئەو زانیاریانەی ماون لەسەر پەنجەرەکان ڕوونی بکەینەوە لەسەر ئەم نموونەیەی کە زۆربەی زانیاریەکانمان لەسەر باسکرد.

* سەرنج:-

فەرمانی داخستن Close بەهۆی دوگمەکانی سەر کیبۆردەکەشەوە بەئە نجام دەگات و هەنگاوێکی ئاسانترو کورت تریشەو تەنها بە پەنجەنان بە هەردوو کلیکی F+Alt پێکەوە بەئە نجام دەگات.

## گۆڕینی قەبارەی My Computer :

دەگونجێت گەورەکردنی قەبارەی My Computer یان بچووککردنەوەی ئەنجامبدەین، دیارە لەسنووری دیاریکراوی خۆی کە بە پێی توانای کارکردن تیایدا دیاریکراوە گەورە ناکرێت، وە لەهەمان سنووری دیاریکراوی کۆمپانیاش زیاتر بچووک ناکرێتەوە، بەم شێوەیە :-

١- سەهمی ماوسەکە ببەرە سەر سنووری کۆتایی پەنجەرەکەو سەرنج بدە لە گۆڕانی سەهمەکە بۆ شێوەیەك کە هێڵێکەو هەردوو لای گۆڕاوە بۆ سەهم.

٢- پاشان پەنجە بنێ بە کلیکی چەپداو بێ ئەوەی پەنجەی لەسەر لاببەیت وەرە بەرەو ناوەوە بەم شێوەیە دەبینی حەجمەکەی لەباری ئاسۆیدا بچووك دەبێتەوەو سکرۆڵ بۆ پەنجەرەکە دروست دەبێت.




٣- دوواتر دەتوانیت بە ئاڕاستەی سەرەوەش پەنجەرەکە بچووك بکەیتەوە، واتە : بۆئەوەی بەتەنها بەشێوەیەکی ئاسۆیی بچووك نەبێتەوە ئەم هەنگاوانە جێبەجێ بکە :-

* سەهمی ماوسەکە ببە سەر سووچی خوارەوەی پەنجەرەکە.

* کە شێوەی سەهمەکە گۆڕا بۆ پارچە ڕاستەهێڵێکی دووسەر کلیك لەسەر ئەو سووچە بکەو بێ ئەوەی پەنجە لەسەر کلیکەکە لاببەیت وەرە بەرەو سەرەوە. دەبینیت پەنجەرەکە بەرەو سەریشەوە بچووك دەبێتەوە. بێگومان کە پەنجەرەکەمان بچووککردەوە لە هەردوولای پەنجەرەکەوە شریتی هاتووچۆ پێکردن Scroll Bar دروست دەبێت چونکە پەنجەرەکە حەجمی بچووککراوەتەوە ئەگەر بەهۆی ئەم سکرۆڵانەوە نەبێت ناتوانین لەسنووری بەرچاوی پەنجەرەکەدا پێکهاتەکانی ناوی ببینین، بۆیە بە پێویستی دەزانم وەك بەشێك لە پەنجەرەکانی ویندۆوس ئاماژە بەم سکرۆڵە بدەم.

## سکرۆڵ بار Scroll Bar :-

بۆ زانینی بەشەکانی ناو پەنجەرەکان و بینینیان لەکاتی بچووککردنەوەی پەنجەرەکان پێویستمان بەم بەشە هەیە کەخۆی بەشێوەیەکی خۆیی و، بەگوێرەی پێویستی شوێنی پەنجەرەکە دروست دەبێت بەدوو شێوەی جیاوازو بۆ هەردوو ئاستی ئاسۆیی و ستوونی، بەم شێوەیە :-



بەکارهێنانی ئەم بەشە بەگوێرەی پێویستی بەکارهێنەر دەبێت کە لەدوو شێوەی گشتی بـەدەر نـی یـە، ئـەویش بـەکارهێنانی سکرۆڵی ئاسۆیی یە بۆ بینینی ئەو پێکهاتەو هێما ( Icon ) و ئامرازانەی کەلەسەر ئاستی ئاسۆیی پە نجەرەکە دیارنین و دەرنەکەوتوون.
وە سکرۆڵی شاوڵیش بۆ بینینی ئەو بەشانەیە کە لەسەر ئاستی شاوڵی دیارنین ولەبەر چاو نین و ناتوانین کاریان لەسەر بکەین.
وەك چۆن بەکارهێنانی سکرۆڵ بۆ دوو مەبەستی دیاریکراوو سەرەکی یە، وەك پێشتر ڕوو نمـان کـردەوە ئاوەهـاش بـەکارهێنانی سکرۆڵ، واتە چۆنیەتی کلیك کردنی و کارکردن لەسەری بەدوو ڕێگە دەبێت:-
١- بەهۆی کلیك کردن لەسەر هێمای شریتی گواستنەوەکان و بە گوێرەی پێویـستی گواسـتنەوەی ئاسـتی شـاوڵی و ئاسـۆیی دەسـت لەسـەر کلیکی چەپ دادەگرین و دەست لانابەین، یان تەنها یەك کلیکی لەسەر دەکەین، دیارە بەگوێرەی کارەکەمان دەگۆڕێت. بڕوانە وێنەکە.




دەکرێت سەهمی ماوسەکە لەجیاتی ئـەوەی لەسـەر هێماکـانی سـەرەتاو کۆتـایی شـریتی گواسـتنەوەکە دابنـێین بـۆ هاتووچـۆ پێکردنـی شریتەکە، ئەوا لەسەر ناوەڕاستی شریتەکە داینێین و بەگوێرەی پێویستی کارەکەمان بە چ لایەکدا ویستمان دەیجـوڵێنین بـەڵام نابێـت ئەوەمان لەبیر بـچێت کـە دەبێـت پە نجـە لەسـەر کلیکـی چـەپ دابگـرین و لای نەبـەین بۆئـەوەی ئـەم کارەمـان بـۆ بکرێـت و بەشـەکانی پە نجەرەکەی پێ ببینین و کارەکا نمانی تیا ئە نجام بدەین.



## گۆڕینی شوێنی پەنجەرە:-

دەگونجێت پەنجەرەی چالاکی سەر ڕووی شاشە Desktop بگوێزینەوە بۆ شوێنێکی دیکە لەسەر ڕووی شاشەکە، بە بەجێگەیاندنی ئەم هەنگاوانە:-

١- سەهمی ماوسەکە ببەرە سەر شوێنێکی چۆڵی (مەبەست لە چۆڵ ئەوەیە کە ئەوشوێنە هیچ دووگمەیەکی تیادا نەبێت بۆ ئەوەی بەهۆیەوە هیچ گۆڕانێکی فەرمانی ڕوونەدات) شریتی ناونیشانی Title bar پەنجەرەکە:-




٢- پەنجە لەسەر کلیکی چەپی ماوسەکە دابگرە بێ ئەوەی پەنجەت لاببەیت پەنجەرەکە ببەرەو ئەو شوێنە ببە کە دەتەوێت و مەبەستتە، کە بێگومان جوڵەی پەنجەرەکە بە ئاڕاستەی جوڵەی ماوسەکەت دەبێت.

٣- وە بەم شێوەیە بەهۆی کلیکی چەپەوە Click پەنجەرەکان دەگوێزینەوە بۆ ئەو شوێنە نوێیانەی کە دەمانەوێت.





## دووەم: شریتی لیستەکان- menu bar:

لەبەر ئەوە یەکە بە شریتی لیستەکان ناسراوە، چونکە ئەگەر کلیک لە سەر هەر کامێك لەو دووگمانە بکەین کە دەکەونە سەری وەك: (file وedit وview وfavorites وtools وhelp) لیستێکمان بۆ دەکرێتەوە، لەم لیستەدا کۆمەڵێك فەرمان هەیە، کە بە گوێرەی پێویست باسیان دەکەین:

١- فایل –file: لەم بەشەدا پێنج فەرمان هەیە، دیارە ئەگەر هیچ بەشێك (file stored of this computer وhard disk وdrive وdevices with removable storage) چالاك نەبێت، وە ئەگەرنا فەرمانی دیکەی تایبەت بەو بەشە چالاك و، سەلێکتکراوە دەچێتە پاڵ پێنج فەرمانەکە، کە ئاماژە بە چۆنێتی چالاك بوون و، کارکردنیان دەکەین، بە گوێرەی پێویستی بەکارهێنەر، بەم شێوەیەی خوارەوە:






لە باری دووهەمیاندا ، دووای چالاک کردنی هاردی dوەك لە وێنەکەدیارە لیستەکە بووەتە چەندین فەرمان بەهۆی کلیك کردن لە سەر هاردی d،کە ئەگەر کلیك لەسەر هەر هاردێکی دیکە یان فۆڵدەرێکی دیکەش بکەین هەمان ئەم لیستە چالاك دەبێت ،کە لە خوارەوە باسی فەرمانەکان دەکەین و،بە نموونەوە ڕونیان دەکەینەوە ،بەم شێوەیە :

## *open:

دوای ئەوەی کلیکمان لەسەر هاردێك ،یان فۆڵدەرێك کرد ،ئەم بەشە لە لیستی فایل دا چالاك دەبێت ،کە بەکلیك کردن لەسەری پە نجەرەی کلیك لە سەر کراو چالاك بەهۆی کلیکەوە دەکرێتەوە،کە ئێمە لێرەدا هاردی d-مان چالاك کردووە:




ئەم وێنەیەی ژێرەوە حاڵەتی دووای کلیك کردن لەسەر openڕووندەکاتەوە:



***explore:**

**بەكلیك كردن لەسەری بەشی چالاك دەكرێتەوە كەلێرەدا بریتییەلە هاردی d:**




***search:**

**بەكلیك كردن لەسەر ئەم بەشە پەنجەرەی تایبەت بە گەڕانت بۆ دەكرێتەوە، كە دەتوانیت بەهۆیەوە بە شوێن ئەو فایل و فۆڵدەرەدا بگەڕێیت كە دەتەوێت بیدۆزیتەوە، دیارە فایل و فۆڵدەری ئەو بەشەی كە سەلێكت و دیاریت كردووە،بەم شێوەیە:**



دواى كليككردن لەسەر فەرمانەكە ،ئەم پە نجەرەيەى خوارەوەت بۆ دەكرێتەوە كە تايبەتە بەگەڕان:




سەرنجـــــــــــــــــــــ:

لەبەشى all or part of the file nameدا ناوى ئەو فايلە بنووسە كە دەتەوێت بە شوێنى دا بگەڕێت بۆ نمونە ئێمە بـەواى فـايلى zamwa٢دا گەڕاوين ،و دواى نوسينى ناوەكەو كليككردن لەسەر دووگمەى search…ئەنجامەكەمان دەداتێ:



### * scan d:/:

ئەم بەشە بۆ سكان كردن و گەڕان بەدوای ڤایرۆسدا بەكار دەهێنرێت،بە هۆی ئەو ئەنتی ڤایرۆسەی كەلە كۆمپیوتەرەكەدا دابەزیوە:




### *format...:

بۆ فۆرماتكردنی ئەو بەشە بەكاردەهێنرێت كە چالاكەو سەلێكت كراوەو كلیكی لەسەر كراوە ،ئەویش بەكلیككردن لەسەری و پاشان كایك كردن لەسەر دووگمەی start ئەو پە نجەرە نوێیەی بۆت دەكرێتەوە،و چاوەڕوانكردن تا خانە چوارگۆشە شینەكەكان پڕببێتەوە، و پاشان بەكلیك كردن لەسەر دووگمەی close پە نجەرەی فەرمانەكە دادەخەینەوە:



**: create short cut***

بۆ دروستكردنی شۆرت كەت( كورتكراوەی بـڕدراو ) بـەكاردەهێنرێت ،وەلێ ئـەم شـۆرتكەتەمان لـە نـاو my computer دا بـۆ دروست ناكات ،بۆیـەكلیكی okدەكـەین لـەو پە نجـەرەنوێ یـە بـچوكەی بۆمـان دەهێنێتەسەرشاشـە وەك ئاگادارییـەك كـە پێمـان دەڵێت ئایـا دەمانەوێت لەسەر شاشەكەdesktopبۆمان دروستبكات یاننا :



دوای كلیك كردن لەسەر فەرمانەكە ئەم شێوەیەی خوارەوەت بۆ دروست دەبێت ئەگەر بتەوێت شۆرت كەتێكت لەسەر دیسك تۆپ بـۆ دروست بكات ئەوا كلیكی yesبكە :



## *delete:

بۆ سڕینەوەی فایل یان فۆڵدەرێك بەكاردەهێنرێت ،كەبەشێكن لەناو هاردەكاندا ،ئەگەرنا ئـەم فەرمانـە چـالاك نییـە لـە بـاری كلیـك نەكردن لە سەر فایل یان فۆڵدارێكدا بۆ یە بەشی هاردی دیمان كردەوە تا تـاقیكردنەوە لەسەر فۆڵدەرێك ئە نجامبدەین،كـە دوای كلیـك كردن لەسەر فۆڵدەرەكەو سەلێكت كردنی وپاشان كلیـك كـردن لـە سـەر فـەرمانی deleteئـەوا پە نجەیـەكی بـچوكمان بـۆ دەكرێتـەوەو ،بەكلیك كردن لەسەر yesكارەكە جێبەجێدەبێت و سڕینەوەكە ئە نجامدەدرێت:



## *rename:

ئەم فەرمانە بۆ گۆڕینی ناوی فۆڵدەی یان فایلێك بەكاردەهێنرێت ،كە بـەكلیككردنی نـاوی ژێـر فـایلو فۆڵدەرەكـە چـالاك دەبێـت و شـین دەبێت و سەلێكت دەبێت و دەتوانین بەهۆی دووگمەكانی ماوسەكەوە ناوێكی نوێی بۆ دابنێین و لەجێگەی ناوەكۆنەكە تـایپی بكەین:



## *properties:

بەهۆیەوە پە نجەرەیەكت بۆ دەكرێتەوە كە تـایبە تمەنییەكانی فایل یان فۆڵدەر یان هاردی چالاك و سەلێكت كراوی تێدایە:

## *close:

بۆ داخستنەوەی پە نجەرەی my computerبەكاردەهێنرێت كەهاوكات بەهۆی alt+f4یشەوە هـەمان كـار ئە نجامـدەدرێت ،هـەروەها بەهۆی closeی تـایتڵ بـارێشەوە وەك لە پێشتر بـاسمان كردووە

**٢-EDITئیدێت:** ئەمدووگمەیەی بەشی مینیوبارێش وەك دووگمەی فایل بەكلیك كردنی لیستێك دەكرێتەوە ،كە بە پێویستی دەزانم زۆر بەكورتی ئاماژەبە ناوەڕۆك و كارەكانیان بكەم:

### *undo-پەشیمانبوونەوە:

ئەم فەرمانە بۆ پەشیمان بوونەوە لە دوواهەمین كار بەكاردەهێنرێت و ناوی دوواهەمین كاریش لەدووای وشەی undo وە دەنوسرێت ،بۆ نمەونە ئەگەر بمانەوێت لە حاڵەتی سڕینەوە فۆڵدەری ١٢٣ پەشیمان ببینەوە ،كە دوواهەمین كاربوو ئە نجامماندا،ئەوا كلیك لە سەر ئەم فەرمانە دەكەین:




### *cut-بڕین:

ئەم دووگمەیە بۆ بڕینی فۆڵدەرێك ،یان فایلێكی سەلێكتكراو دەستنیشانكراو بەهۆی كلیكەوە بەكاردەهێنرێت،كە دەتوانین سودی لێوەربگرین و،لەهەرشوێنێكدا ویستمان داینێینەوە:



## *copy-لەبەرگرتنەوە:

ئەم دووگمەیە بۆ لەبەرگرتنـەوەی دەقێك،یـان فایلێك،یـان فۆڵـدەرێك بـەكاردەهێنرێت ،كە پێـشتر دیـاریكراوە selectبـەهۆی كلیـك كردنەوە لەسەری:




## *past-بۆ دانانەوەی بەشێکی لەبەرگیراوە،یان بردراو:

ئـەم فەرمانـە دوای بـڕین یـان كـۆپیكردنی بەشـێكی دیـاری كـراو ، چـالاك دەبێـت،بۆ دانانـەوەی بـە بردراوەكـە،یان لەبەرگیراوەكە،بەهەربرێك ،واتە چەند جارپێویستبێت:




## *past shortcut- دانانەوەی شۆرت كەت:

ئەم فەرمانە وەك فەرمانی پێشتروایەو بۆ دانانەوەی شۆرتكەت بەكار دەهێنرێت كە پێـشتر یـان كـۆپیكراوەو ، لەبـەری گیراوەتـەوە،یان بردراوە.

## *copy to folder...-لەبەرگرتنەوە بۆ فۆڵدەرێك:

بەهۆی ئەم فەرمانەوە دەتوانیت هەر فۆڵدەرێك، یان بابەت و وێنەو ،بەشێکی سەلێکتکراو کۆپی بکەیت بۆ فۆڵدەرێك، ئەویش بە کلیك کردن لە سەر ئەم فەرمانە، و پاشان هەڵبژاردنی فۆڵدەرێك لەو دایەلۆگ بۆکسەی بۆت کراوەتەوە، یان دروستکردنی فۆڵدەرێك بەهۆی دووگمەیmake new folder هەمان دایەلۆگ بۆکسی فەرمانەکەوە، وە پاشان کلیك کردن لەسەر copyبۆ ئەوەی بەشە سەلێکتکراوەکەمان بۆ کۆپی بکات بۆ ناوی ، بڕوانە ئەم دوو وێنەیەی خوارەوەو ، بەوردی سەرنجیان لێبدە:





## *move to folder-گواستنەوەو جولاندن بۆ فولدەر:

سەهمە ماوسەکە ببەرە سەر فەرمانەکەو کلیکی لەسەر بکە:




له  پاشاندا ئەو شوێنە دیارییکە ،کە دەتەوێت فولدەر،یان فایلە دیاری کراو سەلێکت کراوەکەی بۆ بگوێزیتەوە،و دوواتر کلیك لەسەر moveبکە،کە ئێمە لێرەدا فولدەری ١٢٣-مان دیاری کردبوو، پاشان دیسك تۆپمان هەڵبژاردووە وەك ئەو شوێنەی بۆی دەگوێزینەوەو،بەکلیك کردن لەسەر moveدەبینین فولدەرەکە دەچێتەسەر دیسك تۆپ،کە هاوکات دەتوانین بەهۆی دووگمەی make new folder-وە فولدەرێکی نوێ دروست بکەین و، پاشان ئەم فولدەرە دیاری کراوەی بۆ بگوێزینەوە:



### *select all- دیاری کردنی هەمووی:

ئەم فەرمانە بۆ دیاری کردنی هەموو پێکهاتەکانی ناو پە نجەرەیەکی دیاری کراو چالاك بـەکاردەهێنرێت ،هـەتاوەکو ئامادەبکرێـت بـۆ برین،یان کۆپی کردن،یان سرینەوە،یان..........




### *invert selection-هەڵبژاردن ودیاری کردن:

ئەگەر کلیك لەسەر ئەم دووگمەیە بکەین ئەوا پێکهاتەو نـاوەڕۆکی پە نجـەرەی چـالاکمان بـۆ سـەلێکت دەکـات ،ئەگـەر پێـشتر هیـچیان سەلێکت نەکرابێت،بەلاّم ئەگەر پێشتر فایل وفوڵدەر،یان هەر پێکهاتەیەك سەلێکت کرابێت،ئـەوا هـەموو پێکهاتەکـەمان بـۆ سـەلێکت دەکات جگەلەو بەشەی کە پێشتر سەلێکتکراوە:



### ٣-view-پیشاندان:

ئەم بەشە هەموو ئەو فەرمانانە لە خۆدەگرێت ،کە پەیوەندی بە پیشاندانەوە هەیە،و بۆ ئەو مەبەستە کەڵکی لێوەر دەگرین،بەم شێوەیە:

### *toolbars-شریتی ئامرازەکان:

بەهۆی ئەم بەشەوە دەتوانین گۆڕان لە شریتی ئامرازەکاندا بکەین و،بەگوێرەی پێویست زیاد یان کەمی بکەین،ئەویش بەکلیك کردن لە سەر هەربەشێکیان کە هێمای سەحێك لە تەنیشتییەوە دادەنێت ،کە هێمای چالاك بوونی ئەو شریتەیە دەرکەوتنێتی لەسەر شاشەو تووڵ بارِی پە نجەرەکە،وە بە دووبارە کلیك کردن لەسەری لادەچێت و هێمای سەحەکەی بەردەمیشی نامێنێت.

فەرمانەکانی standard button وaddress bar وlinks.... ئەم رێگەیە دەیانگرێتەوە:



سەرنجــــــــ١ـــــــــــــ:

بەڵام فەرمانەکانی lock the toolbarsبەکار هێنانی جیاوازە و ،بۆ دەرخستنی شریتێك نییە،بەڵکو بۆ لۆك کردن و جێگیرکردنی تووڵ بارە بۆ ئەوەی شوێنەکەی نەگۆڕێت.



سەرنجـــــــــ٢ــــــــــ :

هـەروەها فـەرمانی ...custom لـە هـەمان بەشی tool bars بـۆ زیـاد کـردن و،کـەمکردنی شـۆرتکەتەکانی تـوولٌ بـارِ بـەکار دەهێنرێت،کە بە گوێرەی پێویستی کارەکەمان دەبێت ،بەم شێوەیە :

١-سەرەتا كلیك لە سەر view دەكەین.

٢-لە لیتی ڤیو دا سەهمی ماوسەکە ببەرە سەر فەرمانی toolbars.

٣-لە لیستە بچوکە نوێیەی بۆت دەكرێتەوە كلیك لەسەر بەشی customs... بكە:




٤-دووای بەئە نجام گەیاندنی ئەو سێ هەنگاوەی پێشوو ،ئەم پە نجەرەیەی خوارەووت بۆ دەكرێتەوە ،كە بە كورتی باسیان دەكەین:



ئەو پەنجەرەیەی کە لە خالّی ٤- دا بۆت کرایەوە ،کەبریتییەلە پەنجەرەی toolbars customize لەم بەشانەی خوارەوە پێکهاتووە،کەبەکورتی ئاماژە بەکارو فەرمانیان دەکەین:




*available toolbar buttons:بەهۆی ئەم بەشەوە کلیك لەسەر ئەو دووگمەیە دەکەین کە دەمانەوێت بۆمان بهێنێتە سەر شاشەکەو ، پاشان کلیك لەسەر دووگمەی add دەکەین بۆ ئەنجامدانی کارەکە.

ئەگەر بمانەوێت دووگمەیەك لەسەر toolbars لاببەین،بەهۆی هەمان بەشەوە دیاری دەکەین بەهۆی کلیك کردنەوە لەسەری و، پاشان کلیك لەسەر دووگمەی remove دەکەین بۆ بەجێگەیاندنی کارەکە.

*text option:ئەم بەشە بۆ دیاری کردن و هەڵبژاردنی دەق بەکار دەهێنرێت،واتە هەڵبژاردنی ناوی ئایکۆنەکانی سەر رووی شاشەکە:

- show text labels:لەم بارەدا ناوی ئایکۆنەکان لە ژێر ئایکۆنەکەدا دەنوسرێت.

-selective text icon on right:لەم بارەدە ناوی دووگمەو ئایکۆنەکان لەلای راستی ئایکۆنەکەوە پیشان دەدرێت .

-no text labels:لەم بارەدا ناوی ئایکۆنەکانی toolbars نامێنێت و دەشاردرێتەوە.

*icon option:هەڵبژاردنی ئایکۆن کە دووشێوەیە:

-small icons:بەشێوەی بچوك دەبێت ئایکۆنەکان.

-large icon:لەم بارەدا ئایکۆنەکان بە گەورەی پیشان دەدرێت.

*current toolbars buttons:لەم بەشەدا هەموو ئەو دووگمانەمان پیشاندراوەکە هەنووکە چالاکن و لەسەر شاشەکن.

*close:بۆ داخستنەوەی پەنجەرەی فەرمانەکە بەکاردێت:

*reset:بۆ پاشگەزبوونەوە لەو کارەی کە کردوومان،بۆ نموونە چەند ئایکۆنێکمان خستبێتە سەر toolbars،یان.....

*move up:جوولاّندنی ئایکۆنێك بۆ سەرەوە،دیارە دوای دیاری کردنی ئایکۆنێك بەهۆی کلیك کردنەوە لە بەشی current toolbars buttons ئەم دووگمەیە چالاك دەبێت و،ئەو دووگمەیەی کلیك مان لەسەر کردووە دەچێتە پێش دووگمەکەی سەرەوە هەم لە بەشی current toolbars buttons دا و هەم لەسەر شاشەکەو پەنجەرەکە toolbars.

*move down:بە پێچەوانەی فەرمانەکەی سەرەوە بەکاردەهێنرێت.



## *status bar-شریتی زانیارییەکان:

بەکلیك کردن لەسەر ئەم دووگمەیە شریتی زانیارییەکان چالاك دەبێت.




## *Explorer bars:

بەهۆی ئەم بەشەوە کە زۆر گرنگە دەتوانین هەندێك فەرمان چالاك بکەین و بەکاری بهێنین وەك: (search... وfavorites وhistory وAdobe PDF و...research وfolders وtip of the day وdiscus)



كليك له سەر هەر بە شێكيان بكەين ، پە نجەرەی تايبەت بەو بەشەمان بۆ دەكرێتەوە ،بۆنموونە كليك لە سەر search... بكە ،كە بەهۆيەوە دەتوانيت گەڕان ئە نجامبدەيت:




### *thumb nail:

يەكێكە لە شێوەكانی پيشاندان كەلەم بارەدا وێنەو بابەتەكانمان بۆ پيشان دادات بە شێوەی نينۆكی پە نجە گەورە،وەك دەزانين ئەو وێنەو فۆڵدەرانەی لەبەر دەستماندايە چيیەو چۆنە.



## *tile:

لەم بارەدا فۆڵدەرو فایلەکانمان لە دوو ستونی تەنیشت یەکدا بۆ پیشان دەدات لەگەڵ ناو پاشگرە کانیاندا ،بێئەوەی بزانین لەچی پێکهاتووە:




## *icon:

لەم بارەدا پیشاندانی فایل و فۆڵدەرەکان بە شێوەی ئایکۆن دەبێت:



## :list*

لەم بارەدا فایل و ئایکۆنەکانت بە شێوەی لیستێك بۆ پیشان دەدات:




## :detail*

لەم بارەدا فایلو فۆڵدەرەکان لەگەڵ بوونی زانیاری تەواو دا  پیشان دەدرێت وەك ( حەجمی فایل و فۆڵدەرەکانsize وجۆرەکانیــانtype و date modifiedڕۆژی خەزنکرن و دروستکرنی ) :



## *arrange icon by:

ئەم بەشە بۆ ڕێك و پێك كردن و ڕیزكردنی ئایكۆنەكان بەكاردەهێنرێت، كە چەند شێوەیەكە، بەكورتی باسیان دەكەین و، بە نموونەوە ڕوونیان دەكەینەوە:

- ئەگەر كلیك لەسەر Name بكەین ئەوا بەگوێرەی یەكەم پیت و دووەم پیتی ئەو ناوەی لەژێر ئایكۆنەكەدا نووسراوە بۆمان ڕیز دەكات، واتە : بە گوێرەی ABCD ی زمانی ئینگلیزی.




- ئەگەر كلیك لەسەر Size بكەین ئەوا بەگوێرەی حەجمەكانیان ئایكۆنەكانمان بۆ ڕیز دەكات.



- ئەگەر کلیك لەسەر Type بکەین ئەوا بەگوێرەی جۆرەکانیان ئایکۆنەکانمان بۆ ریز دەکات.




- ئەگەر کلیك لەسەر Modified بکەین، ئەوا بەگوێرەی بەرواری دواهەمین ڕێکخستن ئایکۆنەکانمان بۆ ڕێك دەکات.



show in group-: بە كليك كردن لە سەر ئەم بەشە فايل و فۆڵدەرەكانت لە گروپ گەلی جياوازدا بۆ پيشان دەدات ، بۆ نموونە هەموو فايلە ئەكرۆباتەكان پێكەوە وەك لە وێنەكەدا ديارە، وەهەموو فايلەكانی ۆرد پێكەوەوە ، هەموو فۆڵدەرەكان پێكەوە وەهەروەها،....




- ئەگەر كليك لەسەر Auto Arrange بكەين، ئەوا بەشێوەيەكی خۆيی ( ئۆتۆماتيكی ) ئايكۆنەكانمان بۆ ڕێكدەخات.



- ئەگەر كلیك لەسەر Align to Grid بكەین ئەوا ئایكۆنەكان ڕێكدەخات بۆ گرایدەكان.



**:choose detail***

بەهۆی ئەم فەرمانەوە دەتوانین پیشاندانی تایبە تمەندییەكانی دۆكیۆمێنتێك ،یان فۆڵدەرەكان بگۆڕین،ئەویش بەكلیك كردن لەسەر ئەم فەرمانە ،كە بەهۆیەوە پە نجەرەی تایبەتی فەرمانەكەت بۆ دەكرێتەوەو،لەو پە نجەرەیەدا كلیك لەو تایبە تمەندییە دەكەیت كە دەتەوێت و پێویستتە بیزانیت ئەوا كلیك لە ناو چوار گۆشە بچوكەكەی بەردەمەكەی دەكەین و دواتر كلیك لەسەر okدەكەین.



***go to:**

**ئەم فەرمانە بۆ ڕۆیشتن بۆ ... بەکاردەهێنرێت، کە چەند بارو حاڵەتێکەو، بەکورتی ئاماژەیان پێدەکەین:**

**back-: بۆ گەڕاندنەوەی دووایین بار بۆ باری پێشتر بە کاردەهێنرێت، بۆ نموونە دوای ئەوەی هاردی d-مان کردەوە دەتوانین بەهۆی ئەم فەرمانەوە بگەڕێینەوە بۆ My computer:**




***forward:**

**بەهۆی ئەم فەرمانەوە دەتوانیت بگەڕێیتەوە بۆ هەمان باری پێشتر، واتە دەتوانیت کارەکەی پێشتر (back) پێچەوانە بکەیتەوە:**



-up on level:

به‌هۆى ئه‌م فه‌رمانه‌وه گۆڕان به ئاستێك بۆ سه‌ره‌وه ڕووده‌دات ،بۆنموونه دواى كردنه‌وه‌ى My computer به‌كليك كردن له‌سه‌ر ئه‌م فه‌رمانه پێكهاته و ئايكۆنه‌كانى ديسك تۆپمان پيشان ده‌درێت:




-home page:

به كليك كردن له‌سه‌ر ئه‌م فه‌رمانه ماڵپه‌رى تايبه‌تى كۆمپانياى مايكرۆسۆفتت بۆ ده‌كرێته‌وه.




*refresh:بۆ ريفريش كردن و ،ئاسايكردنه‌وه پيشاندان و باره‌كان به‌كار ده‌هێنرێت.

## ٤-Favorites-هیوایەت:

ئەم لیستە هەموو ئەو فەرمانانە لە خۆ دەگرێت، کە پەیوەندی بە بەشە حەزی و هیوایەتییەکانەوە هەیە، کە بەکورتی باسیان دەکەین بەم شێوەیەی خوارەوە:

*Add to Favorites: ئەم فەرمانە بۆ خەستنە پاڵی هەر بەشێك بەکار دەهێنرێت، کە خۆمان حەزمان لێبێت، بۆ دووبەشی دیاری کراو کە، بریتین لە: links و Favorites:



دوای ئەوەی کلیک لە سەر فەرمانەکە کرد، ئەوا دەیەلۆگ بۆ کسی تایبەتت بۆ دەکرێتەوە، کە دەتوانیت بەهۆیەوە گۆڕانەکە ئە نجامبدەیت:



ok-: بۆ بەئە نجام گەیاندنی کارەکە بە کار دەهێنرێت.

cancel-: بۆ پەشیمان بوونەوە لەکارەکە بەکار دەهێنرێت.

create in-: بۆ دیاری کردنی شوێنی دروستکردن و خستنە پاڵی بەشەکە بەکاردێت.

new folder-: بۆ دروستکردنی فوڵدەرێکی نوێ، هەتاوەکو ئیزافەکردنەکەی لەناوا ئە نجامبدەین.

*organize favorites:ئەم دووگمەیە بەكار دەهێنرێت بۆ گۆڕان و،دەستكاری كردن لە ئەندامە كانی بەشی هیوایەتدا :




دوای كلیك كردن لەسەر فەرمانەكە ، پە نجەرەی فەرمانەكە چالاك دەبێت، وەك لە وێنەكەدا دیارە:




-create folder: بۆ دروستكردنی فۆڵدەری نوێ بەكار دەهێنرێت.

-rename:بۆ گۆڕینی ناوی فۆڵدەر، یان فایلەكان بەكاردەهێنرێت.

-Move to Folders:بۆ گواستنەوەی بەشی دیاری كراو بۆ فۆڵدەر بەكار دەهێنرێت.

-Delete:بۆ سڕینەوەی فۆڵدەر، یان بەشێكی دیاری كراو بەكار دەهێنرێت.

-close:بۆ داخستنەوەی پە نجەرەكە سودی لێوەردەگیرێت و ، ئەو كارەی پێسپێردراوە.

..........................................................................................

*links:سەهەم ماوسەكەی دەبەینە سەر و ،بەهۆیەوە هەموو ئەو بەشانی دەبینین كە جێگیرن تیایدا و هەموو ئەو بەشانەش كە خۆمان دامانناوە تیایدا.

..........................................................................................

هەموو ئەو بەشانەی لەدوای links–وە دێن ئەو بەشانەن كە لەهیواتدان و بەكلیك كردنیان دەكرێنەوە.

## ٥-tools-لیستیئامرازەکان:

فەرمانەکانی ئەم لیستە زۆر جێگەی بایەخ نین بۆ ئاستی سەرەتای و ناوەندی ،بۆیە تەنها ئاماژە بە دوواهەمین فەرمانیان دەکەین:

*Folder Option:هەڵبژاردنەکانی فۆڵدەر ئە نجامدەدرێت بە هۆیەوە:




بە هۆیەوە دایەلۆگ بۆ کسی فەرمانەکەمان بۆ دەکرێتەوە کە دوای ئە نجامدانی گۆڕانەکان کلیك لەسەر okدەکەین:



## ٦-Help-یارمەتی:

**ئەم لیستە هەندێك بەشی تیادایە كە بۆ یارمەتی وەرگرتن و،زانینی بەكارهێنان و،چارەسەركردنی كێشەكان بەكاردەهێنرێت:**

-help and support center:

**بەكلیك كردن لە سەر ئەم فەرمانە، كە بەشێكە لە لیستی یارمەتی دایەلۆگ بۆ كسی یارمەتی و سە پۆرت كردن چالاك دەبێت:**




**دوای ئە نجامدانی ئەو كارەی پێشوو ، پە نجەرەی تایبەت بەفەرمانەكە دەكرێتەوە، كە بەرنامەكە لەم پە نجەرەیەدا كۆمەڵێكی زۆر زانیاری یارمەتدەری هەڵگرتووە:**




**لەسەر هەر بەشێكیان كلیك بكەین زانیاری تایبەت بەو بەشەمان پیشان دەدات و ،گەر زمانی ئینگلیزی شارەزابین ،ئەوا دەتوانین سودی تەواوی لێوەربگرین.**

## سێهەم:toolbars-شریتی ئامرازەکان:



لەبەرئەوەی بەکار هێنانی ئەم دووگمانە : ( back وforward وup وfolders وsearch وviews)لە بەشی دووەم / menu barsلیستی viewدا باسکراون بە پێویستی نازانم دووبارەی بکەمەوە.

.......................................................................................................

## چوارەم:Address bars-شریتی ناونیشان:

وەك لەناوەکەیەوە دیارە بەهۆی ئەم بەشەوە دەتوانین ناونیشانەکان ببینین ،ئەویش بەکلیك کردن لە سەر ئەو هێمایەی لە کۆتای لاکێشەی ناونیشانەکەدایە،وەك لە وێنەکەدا دیارە:




بە کلیك کردن لەسەرهەر بەشێکیان ئەو بەشە دەکرێتەوە.

**لە کۆتای Address bar دا هێمای >> لە بەردەم وشەی links دا هەیە کە ئەگەر کلیکی لەسەر بکەین کۆمەڵێك بەشی لینك کراو دەبینین کە دیسان بەکلیککردنیان دەکرێنەوە:**




**پێنجەم: scroll bars-شریتی هات و چۆپێکردن:**

**ئەم شریتە وەك لە ناوەکەیەوە دیارە بۆ هات و چۆپێکردن بەکاردەهێنرێت ، هەتاوەکو ماوەڕۆك و پێکهاتەکانی ناو پەنجەرەی چالاك ببینین:**



## پێنجەم:بەشی ئایكۆن و دووگمەكان:

مەبەست لەو بەشەی پە نجەرەكەیە كە زۆربەی بە شەگرنگەكان و دووگمەكانی لەخۆگرتووە،وەك : ( هاردەكـان و سـیدی و سیدی ڕایـت و فلۆپی و فوڵدەرەكان )كەدوواتر بـاسی زۆربەیان دەكەین هەرلەم بەشەدا:




## شەشەم:شریتی زانیارییەكان-status bar:

مەبەست لەو شریتەیە كەدەكەوێتە كۆتـای پە نجەرەی My computerو بەهۆیەوە هەندێك زانیاری دەزانین:




## حەوتەم:بەشی تـایبەت بە هاردو ئـایكۆنی چالاككراو:

ئەگەر هاردی dبكەیتەوە ئەوا بەشێكی تـایبەت بەم هاردە لە پە نجەرەكەدا دەبینرێت:



# بەکارهێنانی فلۆپی



فلۆپی یەکێکە لەو هۆیە یارمەتیدەرانەی کەبۆ گواستنەوەی زانیاری لە کۆمپیوتەرێکەوە بۆ کۆمپیوتەرێکی تر سوودی لێوەردەگیرێت و زۆر سووکەو جێگەش کەم دەگرێت و نرخەکەشی هەرزانە، بەڵام گرفتی ئەوەی هەیە کە زوو خراپ دەبێت و، تەنها بۆ دوو سێ جارو بۆ ماوەیەکی کەم بەکاردەهێنرێت و دواتر دەبێت فڕێ بدرێت و، تا ڕادەیەکیش قەبارەکەی کەمەو تەنها ١,٤٤ MB زانیاری دەگرێت.

لێرەدا بەکورتی باس لە چۆنێتی هەڵگرتن و پاراستنی (save) بابەت و زانیاری دەکەین لەسەری،وە کردنەوەو بەکارهێنانی لە کات و شوێنێکی دیکەدا وە چۆنێتی سڕینەوەی هەموو بابەتەکانی ناویو فۆرمات کردنی ڕووندەکەینەوە.

## یەکەم/ گواستنەوەی زانیاری بەهۆی فلۆپی یەوە

١- فلۆپی یەکەت بخەرە ناو فلۆپی درایڤەکەوە، بە شێوەیەکی زانستی و لەسەرخۆ.



٢- ئەو هاردەی بابەت و زانیارییەکەی تێدایە کە دەتەوێت بیخەیتە سەر فلۆپییەکە بیکەرەوە.




٣- سەهمی ماوسەکە ببە سەر فایلەکە (وێنە- نووسراو- ...) و کلیکی ڕاستی لەسەر بکە.



٤- پاشان سەهمی ماوسەکە بهێنەرە سەر بەشی send to و کە بەهۆیەوە لیستێکی ترت بۆ دەکرێتەوە، لەم لیستەی کە بۆتکرایەوە کلیکی Floppy A: بکە.




پاش کەمێك چاوەڕوانی فایلەکە دەچێتە سەر فلۆپییەکە، دیارە دوای لاچوونی دایەلۆك بۆکسی هێمای گواستنەوەی فایلەکە بۆناو فلۆپییەکە.



## دووەم/ کردنەوەی فلۆپی :

**دوای ئـەوەی فایلەکـەمان گواسـتەوە بۆسـەر فلۆپیەکـە ، ئێـستا فلۆپیەکـە دەبەینـە سـەر ئـەو کۆمپیوتـەرەی کـە دەمانەوێت کاری لەسەر بکەین و، دەیکەینەوە بەم شێوەیە :-**

١- فلۆپیەکە بەشێوەیەکی لەسەرخۆ دروست دەخەینە ناو فلۆپی درایڤەکەوە.



٢- بەشی My Computer بکەرەوە ( وەك لە بەشـی کردنـەوەی ئایکۆنـەکانی سـەر ڕووی شاشـە Desktop و فەرمانـەکانی لیـستی تاسك task menu دا باسمانکردووە ).



٣- دوانە کلیك double click لەسەر بەشی :Floppy A بکە، بۆکردنەوەی فلۆپی یەکە.



یان کلیکی ڕاستی لەسەر بکەو پاشان کلیك لەسەر بەشی open بکە لـە لیـستە نوێیەکەی کـە بـەهۆی کلیکـی ڕاسـتەوە Right click بۆتکرایەوە.



به ئه نجامدانی هەرکام لەو دوو ڕێگەیەی سەرەوە بێجیاوازی ،کارەکەمان بۆ بەئه نجامدەگات و،فلۆپییەکە دەکرێتەوە :




که فلۆپیەکەمان بۆ کرایەوە هەموو ئەو فایلانە دەبینین کە پێشتر گواستبوومانەوە بۆ سەری، یان هەڵمانگرتبوو پاراستبوومان لەسەری، کە بە دوانە کلیك double click لەسەر هەر کامێکیان دەکرێتەوەو چالاکدەبێت.



## سێهەم/ هەڵگرتن و پاراستنی زانیاری لەسەر فلۆپی:

جیاوازی لەنێوان هەڵگرتن و پاراستنی زانیاری بەهۆی فلۆپییەوە لەگەڵ گواستنەوەی زانیاری بەهۆی فلۆپییەوە لەوەدایە کە لەم بارەداو لە پاراستن و هەڵگرتندا ڕاستەوخۆ فایلەکە لەسەر فلۆپی سەیڤ Save دەکەین، بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم شێوەیە کار لەسەر فایلێکی وێرد دەکەین:-

١- دوای ئەوەی فایلێکمان ئامادەکرد، سەهمی ماوسەکە دەهێنینە سەر بەشی File و کلیکی لەسەر دەکەین کە بەهۆیەوە لیستێکمان بۆ دەکرێتەوە.




٢- لەو لیستەی بۆمانکرایەوە کلیك لەسەر Save یان Save as دەکەین، کەبەهۆیەوە دایەلۆگ بۆکسی سەیڤمان بۆدەکرێتەوە



٣- كليك لەسەر سەهمە بچووكەكەی بەشی look in ی دایەلۆگ بۆكسی Save دەكەین و بەهۆیەوە Floppy A: هەڵدەبژێرین، دیارە بەكليك كردن لەسەری.

دواتر ناوێك بۆ فایلەكە دەنووسین لەبەشی File name داو لەبەشی File as type یشدا جۆری فایلەكە دیاریدەكەین.







٤- لە كۆتاییدا كليك لەسەر Save دەكەین و پاش كەمێك چاوەڕوانی فایلەكەمان بۆ سەیڤ دەبێت لەسەر فلۆپیەكە. بۆ دیتنی بابەتەكەو كردنەوەی فلۆپیەكە دەتوانین هەنگاوەكانی ( دووەم/ كردنەوەی فلۆپی ) جێبەجێ بكەین كە پێشتر باسمانكرد.

## سەرنج:- جگە لەو شێوەیەی بۆ گواستنەوەی زانیاری بەهۆی فلۆپییەوە، شێوەی دیکەش کە هەمان کارمان بۆ بە ئەنجامدەگەیەنێت، بەم شێوەیە:-

١- ئەو هاردەی فایلەکەی تێدایە بیکەرەوە پاشان سەهمی ماوسەکە ببە سەر فایلەکەو کلیکی ڕاستی لەسەر بکە.



٢- کلیك لەسەر بەشی Copy، یان Cut بکە، لەو لیستەدا کەبەهۆی کلیکی ڕاستەوە بۆتکرایەوە.



بەم شێوەیش نووسخەیەکی ئەو فایلەت دەستکەوت کە دەمانەوێت بیگوێزینەوە، بۆیە ئێستا فلۆپییەکە بکەرە ناو فلۆپی درایڤەکەوە و بیکەرەوە.




پاشان کلیکی ڕاست بکەو دواتر کلیك لەسەر بەشی Past بکە بەم شێوەیەش ئەو نووسخەیەی دەستمانکەوت لە فلۆپییەکەدا دایدەنێینەوەو ئێستا دەتوانین ئەو فایلە بگوێزینەوە.




سەرنج:- بۆئەوەی بەهەڵەدا نەچین لە کلیك کردن لەسەر بەشی Copy یان Cut پێویستە بزانین جیاوازی لەنێوان ئەو دوانەدا چییە؟ دیارە بەکلیك کردن لەسەر کۆپی Copy نووسخەیەکی ئەو فایلەمان دەستدەکەوێت بێ ئەوەی فایلەکە هیچی بەسەربێت، بەڵام بە کلیك کردن لەسەر Cut ئەوا فایلەکە لە جێگەی خۆی نامێنێ‌و، لادەچێت و تەنها نووسخەیەکی نوێمان لێی دەست دەکەوێت و هیچی تر.

# چوارەم/ سڕینەوەو فۆرماتی فلۆپی

**بۆئەوەی بەیەكجار هەموو فایلەكانی ناو فلۆپییەكەت بسڕیتەوەو فۆرماتی بكەیت پێویستە ئەم هەنگاوانە جێبەجێ بكەیت:-**

**١- فلۆپی یەكە بخەرە ناو فلۆپی درایڤەكەوە.**



**٢- بەشی** My Computer **بكەرەوە (وەك لە پێشەوە باسكرا).**



٣-سەهمی ماوسەکە ببە سەر بەشی :Floppy A کلیکی ڕاستی لەسەر بکە.




٤- لەو لیستەدا کەبەهۆی کلیکە ڕاستەکەوە بۆتکرایەوە کلیکی فەرمانی Format بکە.



**٥- کلیك لەسەر دوگمەی** start**بکەو بووەستە تا فۆرماتەکە تەواو دەبێت و لە کۆتاییدا دایەلۆگ بۆکسەکە دا بخە بە کلیك کردن لەسەر** Close .




**سەرنجــــــــــــ١ــــــــــــــــ :**

**لەبەر ئەوە فلۆپیمان لانەبوو بۆیە وێنەکەی سەرەوە وێنەی فۆڕماتی هاردی** e**-یە.**

**سەرنجــــــــــــ٢ــــــــــــــــ :**

**فۆڕماتکردنی هەموو هاردەکان وەك فۆڕماتی فلۆپی وایەو هیچ جیاوازییەکی نییە ،بۆیە لـەکاتی خۆیـداو لەباسـی هاردەکانـدا دووبـارە باسیان ناکەینەوە .چونکە بە پێویستی نازانین.**

**سەرنجــــــــــــ٣ــــــــــــــــ :**

**ئـەو لیـستەی کەبـەهۆی کلیکـی ڕاسـتی سـەر هێمـای فلۆپییەکـەوە بـۆت کرایـەوە ،لـەخاڵی ٤دا،وەك هـەمان لیـستی فـایلی** My Computer**وایە لە بەکارهێنان و کارکردندا بۆیە بە پێویستی نازانم دووبارەی بکەمەوە،وە هەمان لیـستیش بـەهۆی کلیکـی ڕاسـتەوە ،بۆ هەریەك لە هاردەکان بێجیاوازی دەکرێتەوە کەهەمان کارکردنیان هەیە.**

# بەکارهێنانی سی دی CD

سیدیش وەك فلۆپی بۆ گواستنەوەی زانیاریو هەڵگرتن و پاراستنی Save زانیاری لەسەری سوودی لێوەردەگیرێت، بەڵام لەمبارەدا دەبێت کۆمپیوتەرەکەمان Write...CD ی لەسەر بێت، کە کەم کۆمپیوتەر لەسەرێتی چونکە زۆر گرنگ نی یە بۆیە کەمتر بۆ گواستنەوەی زانیاری بەکاردەهێنرێت، بەڵام بۆ مەبەستی پاراستن و هەڵگرتنی زانیاری زۆر باشەو زۆربەی فیلم و مۆسیقاو بەرنامەو، وێنەو، دەقەکان لەناو سیدیدا هەڵدەگیرێن و دەپارێزرین. لێرەدا باسی یەکێك لە بەکارهێنانی سی دی دەکەین کە کردنەوەیەتی بۆ بینینی ئەو زانیاریو شتانەی کە لەناویدایە، بۆ ئەم مەبەستەش سیدی strike magazine بەکاردەهێنین:-

١- سیدی strike magazineدەخەینە ناو سیدی درایڤەکەوە.

٢- بەشی My Computer دەکەینەوە.




٣-دووانە کلیك لەسەر بەشی تایبەت بە سیدی دەکەین کە وێنەی سیدییەکی تیادایەو لە تەنیشتیدا نووسراوە (:CD Drive (F بەم شێوەیە سیدییەکەمان بۆ دەکاتەوەو پێکهاتەی ناو سیدییەکە دەبینین و دەتوانین کاری لەسەر بکەین.(یان کلیکی ڕاست و، پاشان کلیك کردن لەسەر openلەو لیستە نوێ یەی بۆت دەکرێتەوە)



# بەشی چوارەم




## ڕووی شـــــاشــــه

## Desktop

## ڕێکخستنی پەنجەرەکان لەسەر ڕووی شاشە :-

### یەکەم :- ڕێکخستنی یەك لەدوایەك :-

**دەگونجێت زیاتر لە پەنجەرەیەك لەسەر ڕووی شاشەکە بکەینەوە لەیەك کاتدا، بە نموونە کردنەوەی هەردوو پەنجەرەی** My Computer, Recycle bin **بەم شێوەیە :**

**کە یەکێکیان دیارە لەسەر ئەوی تریان و دەگونجێت..وەك لە پێشەوە فێرکرای :- "حەجمیان بچووك بکەیتەوەو وەك یەکیان لێ بکەیت و پاشان ڕێکیان بخەیت بەشێوەی دووا بە دووا کە ئەمە یەکێکە لە سیفەتە چاکەکانی بەرنامەکانی** Microsoft" **ئەویش بە ئەنجامدانی ئەم خاڵانەی خوارەوە :-**

**١- سەهمی ماوسەکە ببەرە سەر شوێنێکی تاسك باڕ** Task bar .




**٢- پاشان کلیکی ڕاست بکەو دەبینیت لیستێك فەرمانت بۆ دەکرێتەوە :**



٣- فەرمانی Cascade Windows لەو لیستەی سەرەوە هەڵبژێرە، سەرنج بدە کە هەردوو پە نجەرەی کراوە بەشێوەی دووا بـە دووا ڕیزبوون.




## دووەم:- ڕێکخستنی ئاسۆیی و شاوڵی:-

جگە لەو ڕێگەی ڕێکخستنەی لە پێشەوە باسمانکرد ڕێکخستنی ئاسۆیی و شاوڵیش لەنێوان پە نجەرە کراوە چالاکەکانی سەر ڕووی شاشەکەدا ئە نجام دەدرێت، بەجێبەجێکردنی ئەم خاڵانەی خوارەوە:-

١- سەهمی ماوسەکە بخەرە سەر شوێنێکی بەتاڵی تاسک بار Task bar. (وەك لەفەرمانەکە پێشوودا)

٢- پە نجە بنێ بەکلیلی ڕاستی ماوسەکەدا، واتە کلیکی ڕاست ئە نجام بدە، ئەوا: ئەو لیستەت بۆ دەکرێتەوە:- (وەك پێشتر بینیمان)

٣- ئەم فەرمانە Tile Windows Horizontally هەڵبژێرە، واتە: کلیکی لەسەر بکە ئەوا دەبینی پە نجەرەکان بەشێوەیەکی ئاسۆیی ڕیزبوون و یەکیان لەسەرەوەو ئەویتریان لە خوارەوە، بەم شێوەیە:-



وە ئەگەر لەجێگەی ئەو فەرمانەی سەرەوە Tile Windows Horizontally ئەم فەرمانە Tile Windows Vertically هەڵبژێرین و کلیکی لەسەر بکەین، ئەوا دەبینین پەنجەرە کراوە چالاکەکانمان بەشێوەی ستوونی بۆ ڕیزدەبێت، بەم شێوەیە :-




بەکلیک کردن لەسەر Undo Cascade هەمان لیست لە ڕیزکردنەکەمان پەشیمان دەبینەوە، وە بە هەڵبژاردنی Show the desk top هەموو پەنجەرە کراوەکانی سەر ڕووی شاشەکە بچووک دەبنەوەو بەشێوەی ئایکۆنێك Icon لەسەر بەشی Task bar لەسەر ڕووی شاشەکە دەردەکەون، وە ئەم فەرمانە بەهۆی پەنجەنان بە دوگمەی ( هێمای ویندۆس ) لەسەر کیبۆردەکە،وە پیتی( D ) هەمان فرمان بە ئەنجام دەگات و پەنجەرەکان بچووك دەبنەوە بۆسەر Task Bar وە بەهۆی هێمای minimize لەسەر title bar هەمان فەرمان ئەنجام دەدرێت بێ جیاوازی کەئەمەش کار ئاسانییەکی مایکرۆسۆفتە بۆ بەکاربەران بەتایبەت ئەوانەی لەسەرەتای فێربووندان.



*فەرمانی lock the taskbarبەشێکە لەو لیستەی کەبەهۆی کلیك ڕاست کردنەوە لەسەر task bar کرایەوە و،بۆ لۆك کردن و جێگیرکردنی task barبەکاردەبرێت.

*فەرمانی propertiesکە بەهەمان شێوە بەشێکە لەو لیستەی کەبە هۆی کلیکی ڕاست کردنەوە لە سەر بەشی task barدەکرێتەوە و ،تایبەتە بەگۆڕین و دەستکاری کردنی تایبەت مەندییەکانی شریتی تاسك task bar،بە شێوەیە :

–دوای ئەوەی کلیکی ڕاستت کرد لەسەر تاسك بار task bar، پاشان کلیك لەسەر propertiesبکە :



– لەدوای کلیك کردن لەسەر propertiesئەم پە نجەرەیەی خوارەوەت بۆ دەکرێتەوە ،کە تایبەتە بەو فەرمانە :



- بەشەکانی پەنجەرە چالاکەکە :

١-task bar: لە ژێر ئەم بەشەدا چەند فەرمانێك جێگەی دەبێتەوە ،کە بەکورتی باسیان دەکەین ،وە ئەم فەرمانانە بەکلیك کردن لەناو چوار گۆشە بچوکەکەی بەدەمیان چالاك دەبێت بەم شێوەیە :

*lock the task bar : بۆ لۆك کردن و جێگیر کردنی شریتی تاسك task bar بەکار دەهێنرێت.

*auto hide the task bar:بۆ شاردنەوەی خۆی تاسك بار بەکاردەهێنرێت.

*keep the task bar on top of other windows:بۆ پاراستنی تاسك بارِ لەسەر سەری هەندێك ویندۆز.( بۆ نموونە ئەگەر ئەم کارە جێبەجێبکەیت کاتێك بەر نامەی ۆرد دەکەیتەوە تاسك بارِ دەرناکەوێت )

*group similar task bar button:لەم بارەدا و ئەگەر ئەم بەشە چالاك بێت وکلیك مان لەناو چوار گۆشەکەی بەردەمیداکردبێت،ئەوا ئەگەر چەند بەرنامەیەك ،یان بەشێکی لێك چوو بکەینەوە ئەوبەشانە بەشێوەیەکی خۆی لە لیستێکدا کۆدەبنەوە بەشێوەی دووگمەیەك لەسەر تاسك بارِtask bar.

*show quick launch:ئەگەر کلیك لەناو چوار گۆشە بچوکەکەی بەردەم ئەم فەرمانە بکەین ئەوا ئایکۆن و دوگمەکانی تەنیشت دووگمەی start سەر task barدەردەکەون ،وەبە پێچەوانەشەوە.

*show the clock:بۆ پیشاندانی کات ژمێرەکەی سەر تاسك بارِ.

*hide inactive icon:بۆ شاردنەوەی ئایکۆنە ناچالاکەکان بەکار دەهێنرێت.

*بە کلیك کردن لەسەر دووگمەی custom پەنجەرەیەکی نوێت بۆ دەکرێتەوە :




بەهۆی ئەو پەنجەرە نوێیەی بۆت کرایەوە دەتوانیت هەندێك گۆڕانکارییکەیت،بۆ نموونە ئەگەر کلیك لەسەر behaviorی یەکێك لە name-کان بکەین ،سێ حاڵەت چالاك دەبێت وەك لەو وێنەکەدا دیارە،ئەوانیش:( hide when inactiveواتە شاردنەوەی ئەو ئایکۆنە ئەگەر چالاك بوو،وە always hideشاردنەوەی ئەو ئایکۆنە بۆ هەمیشە،وە always show پیشاندانی ئەو ئایکۆنە بۆ هەمیشە ).

دوای هەڵبژاردنی حاڵێتێکیان کلیك دەکەین. لەسەر ok.

## ٢-Start menu:

بۆ دیاری کردنی شێوەی لیستی تاسك task menu بەکار دەهێنرێت، کە بە شێوەیەکی سەرەکی دوو شێوەیە، بەم شێوەیەی خوارەوە:

start menu-: بەکلیك کردن لەناو بازنەکەی بەردەم ئەم بەشە ، لیستی تاسك بەشێوەی دوو ستونی چالاك دەبێت، وەك لەوێنەکەدا دیارە:




شریتی تاسك دوو ستونەو دوو بەشە

classic start menu-: بەکلیك کردن لەناو بازنە بچوکەکەی بەردەم ئەم بەشە ، لیستی تاسك بەشێوەی کلاسیکی و کۆن و یەك ستونی چالاك دەبێت، بڕوانە وێنەکە:




*لە کۆتاییدا دووایی هەڵبژاردنی هەربەشێك کلیك لەسەر okبکە، یان کلیك لەسەر applyبکە، گەر دەتەوێت بەرلە ڕازیبوون و okکردن شێوەکە ببینیت.

# گۆڕینی تایبەتمەندییەکانی ڕووی شاشە

# Desktop properties

## گۆڕینی ڕووی شاشە :-

بێگومان دەتوانین گۆڕان لەو وێنەیەدا ئەنجامبدەین کە لەڕووی شاشەکەدا ئامادەیی هەیەو لەجێگەی وێنەیەکی دیکە دابنێین، بە بەجێگەیاندنی ئەم هەنگاوانەی خوارەوە:-

١- لەشوێنێکی سەر ڕووی شاشەکە Desktop کلیکی ڕاست بکە، بەمەرجێك ئەو شوێنەی کلیکی لەسەر دەکەیت بەتاڵ بێت و هیچ ئایکۆنێکی لەسەر نەبێت. ئەوا : ئەم لیستەمان بۆ دەکرێتەوە:-



٢- فەرمانی Properties کلیك بکە، بۆ ئەوەی ئەم پەنجەرەیەت بۆ بکرێتەوە:-




٣- فەرمانی Desktop لەناو فەرمانەکانی بەشی سەرەوەی پەنجەرەکەی خاڵی دوو هەڵبژێرە بە کلیك کردن لەسەری.



٤- سەیری وێنەكانی بەشی باكگراوەند Background بكە بە كلیك كردن لەسەر هەریەكەیان كە لە كۆمپیوتەری ناو پەنجەرەی فەرمانەكەوە دەیبینین، تا ئەوكاتەی یەكێك لە وێنەكانمان پێ جوان دەبێت و بە دڵمان دەبێت، وە ئەگەر حەزمان لەو وێنانە نەبوو ئەوا بەهۆی بەشی Browser ەوە، چ وێنەیەكمان بووێت دەیهێنین و دەیكەینە باكگراوەند.



desktop-٥ customize: بەهۆی ئەم بەشەوە دەتوانین ئایكۆنەكانی سەر شاشەكە زیاد و كەم پێبكەین، كە بەكلیك كردن لەسەر ئەم دایەلۆگ بۆكسەی خوارەوە دەكرێتەوە:



*بـەكلیك كـردن لـەناو چوارگۆشـە بـچوكەكەی بـەردەم: ( my computer وmy documents وmy network وinternet explorer )ئەو بەشەچالاك دەبێت كەكلیك ی لەسەر دەكەین.

*change icon: بەهۆی ئەم بەشەوە شێوەی دەرەكی هەر ئایكۆنێك دەگۆڕین، كە دەبێت پێش ئەوەی ئەم فەرمانـە بەئە نجامبگەیـەنین كلیك لەسەر ئەو ئایكۆنە بكەین كە دەمانەوێت بیگۆڕین، كە بەهۆیەوە ئەم پە نجەرەنوێ یە دەكرێتەوە:




دوای ئەوەی پە نجەرەكەت بۆ كرایەوە كلیك لە سەر یەكێك لە شێوەكان بكـەو ، پاشـان كلیـك لەسـەر okبكە، بەمـەش دەگەڕێیتـەوە بـۆ پە نجەرەكەی پێشتر.

*clean desktop now: ئەم بەشە بۆ لایردنی هەر ئایكۆنێكی سەرشاشەبەكاردەهێنرێت ، ڕاسـتەو خـۆو لـە ئێـستادا، كە كلیـك مـان لەسەر كرد ئەم پە نجەرەیەمان بۆ دەكرێتەوە، بڕوانە وێنەكە:



کلیك لەسەر nextبکە :




کلیك لەناو چوارگۆشەبچوکەکەی بەردەم هەر بەشێك بکە کەدەتەوێت لاییبەیت لەسەر desktop،و پاشان کلیکی nextبکە :



لە کۆتاییدا کلیك لەسەر finishبکە :




٦-کلیکی دووگمەی okبکە بۆ ئەوە بگەڕێیتەوە بۆ دایەلۆگ بۆکسە بنچینەییەکە :



٥- لەدوای هەڵبژاردنی وێنەکە کلیك لەسەر Apply بکە بۆئەوەی ئەو وێنەیەی هەڵتبژاردووە لەسەر رووی شاشەکە دەربکەوێت وە ئەگەر پێت جوان بوو دەتوانیت لە پاشان کلیك لەسەر OK بکەیت بۆئەوەی فەرمانەکە بەجێ بێت و پە نجەرە چالاکەکەش دا بخرێت.

* سەرنج:-

ئەگەر ئەو وێنەو باکگراوەندانەمان بەدڵ نەبوو، ئەوا: دەتوانین بەهۆی دوگمەی (Browser) ەوە وێنەی جوان هەڵبژێرین و بیهێنین بۆناو لیستی باکگراوەند و دواتری بە پێی خاڵەکانی پێشوو بیخەینە سەر رووی شاشەکە، کە راستەوخۆ خۆی دەچێتە سەر رووی شاشەکەو دەتوانین یەکسەر Apply کلیك بکەین وە دەتوانین بەهۆی بەشی حاڵەتەکانەوە Position شێوەی وێنەکە لەسەر رووی شاشەکە دیاری بکەین کە سێ حاڵەتە:-

١- Stretch وێنەکە دەکشێنێ و پڕاوپڕی شاشەکەی دەکات و گەورەی دەکات.

٢- Center وێنەکە دەخاتە چەقی شاشەکەوە.

٣- Tile وێنەکە دەکاتە چەند دانەیەك بۆئەوەی هەموو رووی شاشەکە پڕبکاتەوە. وە بەهۆی دوگمەی رەنگەکانەوە Color دەتوانین رەنگێك هەڵبژێرین.

---

# شاشەی وەستاندن:-

شاشەی وەستان یان Screen Saver ئەو بەشە گرنگەی ویندۆیە کە بەکارهێنەر دەتوانێت سوودی لێوەربگرێت بۆ شاردنەوەی شاشەکە پاش کاتێك کەخۆی دەست نیشانی دەکات و بەمەش ئەگەر کۆمپیوتەرەکە بەجێبهێڵی ئەو سکرین سەیڤەرە (پارێزەری شاشە) دێتە سەر شاشەکەو ئەو بەرنامەو کارەی ئێمە لەسەری هەستاوین دیارنامێنێ و بەمەش کەس نایبینێ، بەڵام بە پە نجەنان بە دوگمەیەکی کیبۆردەکەدا، یان جوڵاندنی ماوسەکە ئەم پارێزەری شاشەیە لادەچێت.

Screen Saver دروستکردن ئاسانەو بەم هەنگاوانەی خوارەوە بە ئاسانترین شێوە دروست دەکرێت، بەم شێوەیە:-

١- بەهۆی کلیکی راستەوە ئەم لیستەی خوارەوە بهێنە سەر شاشەکە بە کلیکی راستکردن لەسەر شوێنێکی بەتاڵی رووی شاشەکە، بەم شێوەیە:-




پاشان کلیك لەسەر فەرمانی Properties بکە لەو لیستەی سەرەوەدا. کە ئەم پە نجەرەیەی خوارەوەت بۆ دەکرێتەوە:




٣- فەرمانی Screen Saver لەبەشی سەرەوەی پەنجەرەکەی خاڵی ( ٢ ) کلیك بکە، بەمەش پەنجەرەکەی سەرەوە ( خاڵی٢ ) ئەم شێوەیە وەردەگرێت و، دەگۆڕێت بۆ ئەم پەنجەرەیەی خوارەوە:-



٤- لەبەشی (Screen Saver) پە نجەرە چالاکەکەی سەر ڕووی شاشەکە شێوەیەك هەڵبژێرە بۆئەوەی ببێتە پارێزەری شاشەکە، بەهۆی کلیکی چە پەوە ئەم دیاریکردنە ئە نجام دەدرێت، بەم شێوەیە :




٥- دەتوانیت بە نووسینی کاتێك لەناو لاکێشەی بەردەم بەشی چاوەڕوانیWait دا، کە نابێت سەلێکت کردنی کاتە کۆنەکەمان بیربچێت پێش نووسینی کاتی نویٚ ئەگەرنا کارەکەمان بۆ ناکرێت، وە یان دەتوانین ئەوکاتەی خۆی لەناو لاکێشەکەدا نووسراوە بەهۆی دوو سەهمە بچووکەکەی تەنیشتیەوەو کلیك کردنیان کاتەکە زیادو کەم بکەین بڕوانە وێنەکە :-



سەرنجـــــــــــــــــــــــــ:

ئەگەر لەبەشی screen saverدا ،وێنەو نووسینمان هەڵبژارد ،بۆ نموونە text ٣Dلەم بارەدا چۆن ئەو نووسینەی کەلەسەر وێکەیە بگۆڕین بە دەقێکی تایبەت بە خۆمان ،ئەوا بۆ ئە نجامدانی ئەم کارە ئەم هەنگاوانە دەنێین:

-لە دایەلۆگ بۆکسی screen saverدا و لەتەنیشت بەشی screen saverکـە بەهۆیـەوە ٣D Text-مـان هەڵبـژارد،کلیك لەسـەر دووگمەی setting دەکەین ،کە بەهۆیەوە ئەم پە نجەرەیەی خوارەوەمان بۆ دەکرێتەوە:




-لەبەشی custom textدا ئەو دەقە بنوسەکەدەتەوێت لەبەشی سکرین سەیڤەرو لەسەر وێنەکە دەرکەوێت.

-لەبەشی change fontدا فۆنتەکە بەخواستی خۆت بگۆڕە.

-لە بەشی resolutionدا دیقەی نوسینەکە دیارییکە و ،بەرەو highهێماکە ببەبۆ دیقەی بەرز و بە پێچەوانەشەوە.

-لەبەشی حەجمدا sizeنوینەکەت گەورە یان بچوك بکەرەوە،کە بەبردنی هێماکەبەرەو largeگەورەدەبێت و بە پێچەوانەشەوە.

-لەبەشی rotation speedدا خێرای خولانەوەی نووسینەکەت دیاری بکە ،کـە بـۆ لای فاسـت fastخێرادەبێـت و هێنـانی هێمایەکـە بەرەو slowخاو دەبێتەوە.

-چەندین بەشی دیکەی تێدایە کە دەتوانیت بێترس تـاقییانبکەیتەوە و،گۆڕانەکەیان ببینیت.

٦- لە کۆتـاییدا کلیك لەسەر OK بکە، بۆ جێبەجێبوونی کارەکەمان و داخستنەوەی پە نجەرەکە.

٧- بۆ بینینی ئە نجامی کارەکەمان دەبێت ئەوەندە دەقیقە ڕابووەسـتین و دەسـت لـە مـاوس و هـیچ دووگمەیـەکی ئـامێری کۆمپیوتـەرەکـە نەدەین، کە لەبەشی چاوەڕوانیدا Wait لە پە نجەرەکەداو بـەر لەداخـستنی دیاریمـانکرد. وە دەتـوانین بـۆ ئـەوەی ئـەم چـاوەڕوانیيە نەهێڵین بەر لە ئە نجامدانی خـاڵی ٦ و OK کـردن، کلیـك لەسـەر دوگمـەی preview بکـەین بەمـەش ئـە نجامی کارەکـەمان پیـشان دەدات، بـەڵام پە نجەرەکـە داناخرێتـەوەودەبێت بـۆ لابردنـی سـکرینەکە Screen Saver ماوسـەکە بجـوڵێنین، یـان پە نجـە بـە دوگمەیەکی کیبۆردەکەدا بنێین بۆئەوەی پە نجەرەی فەرمانەکە دەربکەوێتەوەو پاشان و لە کۆتـایدا OK بکەین.

## گۆڕینی ڕەنگ و شێوەی گشتی پەنجەرەکان:-

کاتێك XP Windows کار پێدەکەیت، دەبینیت ویندۆو دوگمەکان ڕەنگ و شێوەیەکیان هەیە، کە ڕەنگە تۆ حەز لەو ڕەنگ و شێوەیە نەکەیت و بتەوێت بیگۆڕیت، چونکە هەندێك ڕەنگ و شێوە چاو ئەزیەت ئەکات، یان جوان نین و بەدڵمان نییە بەتایبەت بۆ کچان کە حەزیان لەڕەنگی سەرنج ڕاکێش و جوانەو حەزیان لەڕەنگی شین و هەندێك ڕەنگی تر کە (متی) هەیە بۆیە بۆ ئە نجامدانی ئەمکارە ئەم هەنگاوانە بەجێ بگەیەنە:-

١- کلیکی ڕاست لەسەر ڕووی شاشەکە Desktop بکە لەشوێنێکدا کە ئایکۆنی تیا نەبێت و بەتاڵ بێت.

٢- لەو لیستەی کە بۆت دەکرێتەوە، وەرە سەر فەرمانی Properties و کلیکی چەپی لەسەر بکە.



دوایی کلیك کردن لەسەر propertiesئەم پەنجەرەیەی خوارەوەت بۆ دەکرێتەوە:



٣- فەرمانی Appearance لە پەنجەرەکەی خاڵی( ٢ ) هەڵبژێرەو کلیکی لەسەر بکە. دەبینیت ئەم بەشە لە پەنجەرەکەی خـاڵی (٢) چالاك دەبێت.




٤- پاشان بەخواستی خۆت لە هەریەك لەم بەشانە شێوەیەك دیاری بکە، وەك ئێمە لێرەدا لە بەشی Windows and button –دا مۆدیلی Windows$^{XP}$ Style –مـان هەڵبـژاردووە، وە لەبەشـی ڕەنگـداری Color Scheme-دا ڕەنگـی blue یـان هـەر ڕەنگێکـی دیکەوە لەبەشی حەجمی خۆتدا Font Size فەرمانی ئاساییمان Normal هەڵبژاردووە.

٥- لە کۆتـایدا دوای دیاریکردنی ئەو بەشانەی خاڵی ( ٤ ) بە گوێرەی خواست و ویستی خۆمان پێویستە کلیـك لەسـەر OK بکـەین، بـۆ بەجێهێنـانی کارەکەمان و داخستنەوەی پەنجەرەکە.

# Themes و ڕێکخستنی ئایکۆنەکانی شاشە :-

## ١- Themes :-

دەتوانین بەهۆی ئەم بەشەی فەرمان (Properties) جۆرو شێوەی وێنەی ویندۆکەمان دیاری بکەین کە بەشـێوەی کـۆن بێت یـان ئـێکس پی، بەم شێوەیە بەهۆی ئەم هەنگاوانەوە:-

١- لە شوێنێکی بەتـاڵی سەر دیسك تۆپ Desktop دا کلیکی ڕاست بکە بۆ دەرکەوتنی ئەم لیستە فەرمانە:-



٢- لەو لیستە فەرمانەی سەرەوەدا بچۆرە سەر بەشی Properties و کلیکی چەپی لەسەر بکە :-




٣- لەو وێنەیەی خاڵی ( ٢ ) کلیکی بەشی themes لە بەشی سەرەوەی پەنجەرەی فەرمانەکە بکە :-



٤- یەکێك لەشێوە ئامادەکراوەکانی ناو بەرنامەکە چاك بکە بە کلیك کردنی و شێوەی هەنووکەیی پێ بگۆڕە کە پێکهاتووە لەم شێوانە :-

* Windows elasic (Modified)
* My Current themes
* Windows Clasic
* Windows XP لەگەڵ هێنانی theme زیاتر لە ڕێگەی ماڵپەر (سایت) ی تایبەتی مایکرۆسۆفت بەهۆی فەرمانی More theme online ناو فەرمانەکان.

وە دەتوانیت بەهۆی بەشی گەڕانی ..Browser پە نجەرەکەو theme دیکە بهێنێو بەهۆی فەرمانی Save as بە ناوێکەوە سەیڤی بکەیت، یان بەهۆی Delete وە، هەر theme یێکت ویست بیسڕیتەوە.



٥- لە کۆتاییدا و دوای ئە نجامدانی ئەو چوار خاڵەی پێشەوە کلیك لەسەر OK بکە بۆ بەجێگەیاندنی فەرمانەکەو داخستنەوەی پە نجەرە چالاکەکەی سەر شاشەکە.

## ٢- Setting:

بەهۆی ئەم فەرمانەوە دەتوانیت دەستکاری دیقەی شاشەکەو چۆنێتی ڕەنگەکەی بکەیت، بەم شێوەیە :-

١- لەشوێنێکی سەر ڕووی شاشەکە Desktop کلیکی ڕاست بکەو پاشان بچۆرە سەر فەرمانی Properties کلیکی چە پی لەسەر بکە بۆ کردنەوەی ئەم پە نجەرەیەی خوارەوە:-




٢- لەبەشی سەرەوەی ئەو پەنجەرەیەی خاڵی (١) کلیکی چەپ لەسەر فەرمانی Setting بکە.




٣- لەبەشی Screen resolutionدا بەهۆی ئەو ڕێژەیەی دانراوە کە بە کلیک کردن لەسەری و گواستنەوەی بۆلای Less کەمدەکرێتەوە، وە بەرەو More زیاد دەکرێت، دیقەی شاشەکە دیاری بکە، وە بەهۆی (Color Quality) چۆنێتی ڕەنگەکە دەست نیشان بکە. بە زیادکردنی دیقەی شاشەکە ئایکۆنەکان Icon بچووک دەبنەوە وە بە پێچەوانەشەوە.

٤- لە کۆتاییدا دوای ئەنجامدانی ئەو سێ خاڵەی پێشوو کلیك لەسەر دوگمەی OK بکە بۆ داخستنەوەی بەرنامەکەو بەجێگەیاندنی فەرمانەکە.

# گواستنەوەی پەنجەرە داخراوەکان لەسەر ڕووی شاشە :-

بەگوێرەی پێویست دەتوانیت پەنجەرەیەکی داخراو کە بەشێوەی ئایکۆن دەبینرێت لەسەر ڕووی شاشەکە هەڵبگریت و لەشوێنێکەوە بیگوێزیتەوە بۆ شوێنێکی تر بەگوێرەی پێویست و بۆ کاری تایبەتیمان، بەهۆی بەجێهێنانی ئەم هەنگاوانەی خوارەوە:-

١- بچۆرە سەر ئەو ئایکۆنی پەنجەرەیەی کە دەتەوێت بیگوێزیتەوە، بە نموونە ئێمە دەچینە سەر ئایکۆنی پەنجەرەی photo impact ١١و کلیکی چەپی لەسەر دەکەین.

٢- کە کلیکمان لەسەرکرد پەنجە لەسەر کلیکەکە لانابەین و هەڵیدەگرین و بە Drug and Drop دەیگوێزینەوە بۆ ئەو شوێنەی کە دەمانەوێت.






## ڕێکخستنی پەنجەرە داخراوەکانی سەر ڕووی شاشە :-

**بێگومان دەتوانین ئەو ئایکۆنانەی لەسەر شاشەکەن بەشێوەی جیاوازو بەگوێرەی حەزو خواستی خۆمان ڕیزی بکەین و گۆڕان لەجۆری ڕیزکردنەکانیاندا ئەنجام بدەین بەهۆی ئەم هەنگاوانەی خوارەوە:-**

**١- لە شوێنێکی سەر ڕووی شاشەکە Desktop کلیکی ڕاست بکە:-**




**٢- بچۆرە سەر فەرمانی ڕیزکرنی ئایکۆن بە پێی Arrange Icons By و دیاری بکە.**



٣- کلیك لەسەر Name بکە هەتا ئایکۆنەکان بەگوێرەی ناوەکانیان، واتە: بەگوێرەی یەکەم پیتی ناوەکانیان بۆ ڕیزبکات.
یان دەتوانیت Size کلیك بکەیت تا بەگوێرەی حەجمەکانیان بۆت ڕیز بکات، یان Type کلیك بکەیت بۆ ئەوەی بەگوێرەی جۆری ئایکۆنەکان بۆت ڕیز بکات، یان ... دەتوانیت کلیکی Auto arrange بکەیت بۆئەوەی بەشێوەی خۆیی (ئۆتۆماتیکی) بۆت ڕیزبکات.




٤- ئەگەر کلیك لەسەر Align to Grid بکەین ئەوا ئایکۆنەکان ڕێکدەخات بۆ گرایدەکان.



-٥ ئەگەر کلیك لەسەر Show Desk Icon بکەین ئەوا ئایکۆنەکانی سەر ڕووی شاشەکە Desktop پیشاندەدرێت و دیاردەبێت.وە بە پێچەوانەشەوە بە دووبارە کلیك کردنی و لابردنی سەحەکەی بەردەمی ئایکۆنەکان دەشارێنەوە:



-٦ دەتوانین کلیك لەسەر lock Web Items On Desktop بکەین بۆ لۆك کردن و نەگۆڕانی بڕگەکانی ویب لەسەر ڕووی شاشەکە Desktop .

-٧دەتوانین بەهۆی فەرمانی run desktop clean up-ەوە، ئایکۆنەکانی سەر شاشە بگۆڕین و کەمیان بکەینەوە:



# دروستكردنی كورتكراوەی بڕدراو ( Shortcut ) :-

دروستكردنی كورتكراوەی بەرنامەكان Shortcut یەكێكە لە تایبە تمەندییە گرنگەكانی ویندۆ كە كارئاسانی بۆ بەكاربەری ئـامێری ئەلكترۆنی كۆمپیوتەر دەكات و هەنگاوەكانی كاركردنی بۆ كەمدەكاتـەوە. چـونكە بـەهۆی دووانـە كلیـك Double click لەسـەر ئـەم Shortcut –ە، یان كلیكی ڕاست Right click كردن لەسەری و پاشان هەڵبژاردنی Open و كلیك كردنی لەسەری، ئەو بەرنامەیە، یان بەشەی كە Shortcut مان بۆ داناوە دەكرێتەوە.

كورتكراوەی بڕدراو: بریتییە لە حەلەقێكی بچووك كە حەجمەكەی لەوانەیە (kilobyte ١)بێت كـە بـە نزیكـەیی ١٠٠ حـرف دەبێـت. لێـرەدا نموونـە بـۆ دروسـتكردنی Shortcut لەسـەر بەرنامـەی نووسـین Microsoft Word٢٠٠٣دەهێنینـەوە. چـونكە .زۆر بەكاردەهێنرێت بۆیە بۆ بەجێگەیاندنی ئەم كارە ئەم هەنگاوانە بگرەبەر:-

١- سەهمی ماوسەكە ببە سەر دوگمەی دەستپێكردن Start و كلیكی لەسـەر بكـە، كـە بەهۆیـەوە لیـستی تـاسك Task menu مـان بـۆ دەكرێتەوە.




٢- سەهمی ماوسەكە ببە سـەر بەشـی هـەموو بەرنامـەكان all program كە بەهۆیـەوە لیـستێكی نوێمـان بـۆ دەكرێتـەوە كـە هـەموو بەرنامەكان لەخۆ دەگرێت.



٣- سەھمی ماوسەکە ببە سەر ئەو بەرنامەیەی کە دەتەوێت، کورتکراوەی shortcut بـۆ دروسـتبکەیت و کلیکـی ڕاسـتی Right click لەسەر بکە، کە بەھۆیەوە لیستێکی بچووکمان بۆ دەکرێتەوە

٤- لەو لیستە بچووکەی بۆمانکراوەتەوە سەھمی ماوسەکە بەرە سەر Create shortcut (Desktop) و کلیکی لەسەر بکە.




یان سەھمی ماوسەکە ببە سەر بەشی send to و کە بەھۆیەوە لیستێکی بچووکترمان بۆ دەکرێتەوەو لەو لیستە بچووکترەدا کلیك لەسەر Desktop بکە. بەم شێوەیە shortcut –ێکمان بۆ دروست دەبێت لەسەر ڕووی شاشەکە. دیـارە جگە لـەم ڕێگەیـە دەتـوانین بەشـێوەو ڕێگەی دیکەش دروستی بکەین، بەڵام ئەم شێوەیەی ئێمە باسمان کـردووە زۆر ئـاسـانەو بـاوترینیانـە، دەنـا دەتوانیـت لەسـەر شـوێنێکی چۆڵی ڕووی شاشە Desktop کلیکی ڕاست Right click بکەو پاشان سەھمی ماوسەکە بهێنـە سـەر بەشـی New و پاشـان create shortcut و بەو شێوەیە.



سەرنجــــــــــــــــــــ:

دەتوانرێت شۆرتکێت بەم ڕێگەیەش دروستبکرێت، بەڵام لەبەر ئەوەی دوو ڕێگەی ترمان ڕونکردۆتەوە ئەم ڕێگەیەیان تەنها ئاماژە بە هەنگاوەکانی دەکەین:

١- کلیکی ڕاست لەسەر ڕووی شاشەکە Desktop بکە، بۆ کردنەوەی ئەم لیستەی خوارەوە:-

٢- سەهمی ماوسەکە بجوڵێنە بۆسەر فەرمانی (تازە) New لەو لیستەی خاڵی دووەدا، بۆ کردنەوەی لیستێکی گرێدراو بەم فەرمانەوە، بڕوانە وێنەکە:-

٣- فەرمانی Shortcut لە لیستە گرێدراوە نوێیەکەدا کلیك بکە بۆ کردنەوەی پەنجەرەی بنیاتنانی کورتکراوەکان Create shortcut بەم شێوەیە:-

٤- کلیك لەسەر دوگمەی ... Browser بکە کە دەکەوێتە بەشی سەرەوەی پەنجەرەکەی خاڵی سێهەم بۆ کردنەوەی ئەم پەنجەرە نوێیەی خوارەوە:-

٥- لەم خاڵەدا دەبێت کلیك لەسەر هێمای + بەردەم My Computer بکەو بەمەش پێکهاتەکانی ناو بەشی My Computer دەکرێتەوە:-

٦- کلیك لەسەر هێمای + لەبەردەم هاردی سی بکە، کە بەمەش پێکهاتەکانی ناوی دەکرێتەوە:-

٧- کلیك لەسەر هێمای + بەردەم بەشی فایلی بەرنامەکان Program File بکە کە هەموو بەرنامەکانی تێدایە:-

٨- کلیك لەسەر هێمای + ئامادە لەبەردەم Windows Nt بکەو پاشان کلیك لەسەر هێمای بەردەم Accessoriess بکە بۆ پیشاندانی ئەو بەرنامانەی کە پاشکۆی بەرنامەی (Windows$^{XP}$) نوو گرێدراوون پێیەوە:-

٩- کلیك لەسەر بەرنامەی Word pad بکە کە بەرنامە داواکراوەکەیە بۆئەوەی کورتکراوەی بڕدراو Shortcut یان بۆ بکەین.

١٠- کلیك لەسەر دوگمەی OK بکە بۆ داخستنی ئەو پەنجەرەیەو بەجێگەیاندنی کارەکەمان.

١١- کلیك لەسەر دوگمەی Next بکە.

١٢- کلیك لەسەر دوگمەی Finish بکە بۆئەوەی پەنجەرەکە دا بخرێتەوەو کارەکەمان بەکۆتایی بگات و ئەنجامی کارەکەمان ببینین:-

## گۆڕینی ناوی کورتکراوەو پەنجەرەکان:-

بێگومان دەتوانین ناوی کورتکراوەو پەنجەرە داخراوەکانی سەر ڕووی شاشەکە بگۆڕین بەهۆی بەجێگەیاندن و جێبەجێکردنی ئەم خاڵانەی خوارەوە:-

١- سەهمی ماوسەکە ببەرە سەر ئەو ئایکۆنەی کە دەتەوێت ناوەکەی بگۆڕیت و کلیکی ڕاستی لەسەر بکە کە بەمەش ئەم لیستەت بۆ دەکرێتەوە:-



٢- كليك لەسەر فەرمانی Rename بكە ، لەو ليسەی بەهۆی كليكی ڕاستەوە بۆت كراوەتەوە، بۆ ئە نجامدانی كارەكە :-




٣- ناوێكی نوێ لەجێگەی ناوە كۆنەكە بنووسەو پاشان Enter بكە، يان كليك لەسەر هێمای ئايكۆنەكە بكە بۆ جێگيركردنی نـاوە نـوێ يەكە.

# سڕینەوەی كورتكراوەو پە نجەرەكان :-

دەتوانين ئەو كورتكراوەو پە نجەرانە بسڕينەوەو لايببەين كە دەكەوێتە سەر ڕووی شاشەكە Desktop بەهۆی ئەم هەنگاوەوە:-

* كليكی ڕاست لەسەر ئەو كورتكراوەيە يان پە نجەرەيە بكە كە دەتەوێ بيسڕيتەوە:-




پاشان كليك لەسەر Delete بكە لەو ليستەدا كەبۆتكراوەتەوە:-



بەمەش لاكێشەیەك دەكرێتەوە كە دوو هەڵبژاردنی Yes, NO ی تێدایە و ئەگەر ویستمان كارەكەمان بۆ بكات و بۆمان بسڕێتەوە ئەوا كلیك لەسەر دوگمەی Yes دەكەین، یان Enter دەكەین وە بە پێچەوانەوە.




یان دەتوانین هەمان كار بە كلیك كردن لەسەر ئەو ئایكۆنەو دەست لانەبردن لەسەر كلیكەكەو هەڵگرتن و گواستنەوەی ئایكۆنەكە بۆناو ئایكۆنی Recycle Bin لەسەر ڕووی شاشەكە.

* سەرنج:-

١- دەتوانین كاری سڕینەوە Delete بە دیاریكردنی ئایكۆنەكە Icon بەوەی كە كلیكی لەسەر بكەین و پاشان پە نجەنان بە دوگمەی Delete سەر كیبۆردەكەو دواتریش پە نجەنان بە دوگمەی Enter ئە نجام بدەین.

٢- دەتوانین بۆ سڕینەوەكە Shift + Delete پێكەوە بەكاربهێنین بۆئەوەی ئایكۆنەكە، یان فایلەكە بەتەواوی بسڕێتەوەو لە تەنەكە خۆڵەكەشدا Recycle Bin جێگەی نەبێتەوە، وەلێ ئەمكارە ئەو زیانەی دەبێت كە ناتوانین جارێكی دیكە ئەو شتە سڕاوەیە بگێڕینەوە گەرچی كاریشمان پێی بێت و زەروور بێت.

# دروستكردنی فۆڵدەر Folders

ئەگەر دەتەوێت لەسەر ڕووی شاشەكە، یان لە یەكێك لە هاردەكاندا فۆڵدەرێك دروست بكەیت، ئەوا ئەم هەنگاوانە بگرەبەر كەمن لەسەر ڕووی شاشەكە Desktop دروستی دەكەم، بەم شێوەیە:-

١- لە سەر شاشەكە كلیكی ڕاست Right click بكە.



٢- لەو لیستە نوێیەی بۆتدەکرێتەوە سەهمی ماوسەکە ببەرە سەربەشی نوێ New کە بەهۆیەوە لیستێکی بچووکمان بۆ دەکرێتەوە.




٣- لەو لیستە بچووکەی بۆمانکراوەتەوە سەهمی ماوسەکە ببە سەر Folder و کلیکی لەسەر بکە.




دەبینیت فۆڵدەرێك لەسەر شاشەکە Desktop دروست دەبێت کە لەژێریدا نووسراوە New Folder و دەتوانیت دوانە کلیك double click لەسەر ئەم نووسینە New Folder بکەین کە بەمەش چالاکدەبێت و، دەتوانین ناوێکی نوێی لە جێگەی بنووسین و دواتر پەنجە بنێین بە دوگمەی Enter ی سەر ڕووی کیبۆردەکەدا بۆئەوەی ئەو ناوە جێگیر ببێت، ئێمە ناومان لێنا Windows XP using . چونکە بابەتەکانی ئەم کتێبەی تیا دادەنێین.

سەرنج:- ئەگەر تۆی بەکارهێنەری کۆمپیوتەر ویستت ئەم فۆڵدەرە لە شوێنێکی دیکەدا دروست بکەیت بۆ نموونە لە یەکێك لە هاردەکاندا، یان لە فلاشدا، یان لە فلۆپیدا، هیچ جیاوازییەکی نییەو دوای ئەوەی بەهۆی یەکێك لە ڕێگەکانی کردنەوەی ئایکۆنەکانەوە هاردەکەمان کردەوە، یان فلاش و فلۆپییەکەمان کردەوە، ئەم سێ خاڵە جێبەجێ دەکەین.

# بەشـــی پێنجەم

# ۆرد پاد




## بەرنامەی نووسین

## Word Pad

بەرنامـەی نووسـینی نێردراوەکـان Word pad یەکێکـە لـەو بەرنامـە گرنگانـەی کـە گرێـدراوی سیـستمی Windows$^{XP}$ یـەو لەگەڵیدایە. ئەمە جگە لە چەندین بەرنامەی دیکەی تایبەت بەنووسینی نامەو نێردراوەکان کە لەگـەڵ ئـەم سیـستەمەدا Windows

کاردەکات وەك بەرنامەی پێشکەوتووی نووسین MS.Word . بۆیە کەمێک لەبەرنامەی Word pad دەدوێین و ئەم بەشەی بۆ تەرخان دەکەین بۆئەوەی ئەو کەسانەی لەئاستی سەرەتایی و ناوەندیدان سوودی تەواوی لێوەربگرن، بەڵام درێژی شیکردنەوەی بەرنامەکە جێدەهێڵین بۆ کات و شوێنێکی دیکە، ئەگەر خوای گەورە تەمەن بدات. کە ڕەنگە لە ئاییندەدا کتێبی تایەت بە Word لە دوو بەرگدا بڵاوبکەمەوە.

## کارپێکردنی بەرنامەکە :-

بۆ کارپێکردنی بەرنامەی Word pad دەتوانین چەند ڕێگەیەك بگرینەبەر:-

١- لەسەر Start کلیك بکەو پاشان کلیکی فەرمانی Run… بکە لە لیستی ( Task menu ) داو لەناو لاکێشە بەتاڵەکەیدا بنووسە Word pad پاشان کلیکی OK بکە، یان پە نجە بنێ بە دوگمەی Enter لەسەر کیبۆردەکە.





٢-دەتوانین شۆرت کەتێك دروست بکەین و بەهۆی دووانە کلیك کردنی دەبڵ کلیك Double click ئەو Shortcut کە دروستی دەکەین بەرنامەکە بکەینەوە ، یان کلیکی ڕاستکردن لەسەر کورتکراوەکە Shortcut و پاشان کلیك لەسەر Open بکە لەو لیستەدا کە بۆماندەکرێتەوە.

٣- دەتوانین بەهۆی جێبەجێکردنی ئەم هەنگاوانەشەوە بچینە ناو بەرنامەی Word pad بەم شێوەیە

١- کلیك لەسەر دوگمەی دەستپێکردن Start لەسەر شریتی Task bar بکە.

٢- بچۆرە سەر All program کە لیستی هەموو ئەو بەرنامانەت بۆ دەکاتەوە کە لەگەڵ ویندۆدا کاردەکەن.

٣- سەهمی ماوسەکە ببەرە سەر Accessories بەمەش لیستێکت بۆ دەکرێتەوە کە بەرنامەی Word padی تێدایە.

٤- سەهمی ماوسەکە ببەرە سەر بەرنامەی Word pad و کلیکی لەسەر بکە بۆ کردنەوەو چالاککردنی بەم شێوەیە :-




سه نج ــــــــ :

هەموو هەنگاوەکان لەو وێنەیەی سەرەوەدا کۆکراوەتەوە ،بۆیە بە پێویستمان نەزانی هەموو وێنەکان دابنێین.

# پێکهاتەی بەرنامەکە :-

پە نجەرەی بەرنامەکە وەك هەر بەرنامەیەکی دیکە لەچەند بەشێك پێکهاتووە کە بەکورتی ئاماژەیان پێدەکەین.

## یەکەم :- شریتی ناونیشان Title Bar

لەلای چە پی ئەم شریتەدا ناوی بەرنامەکە Word pad و ئەو فایلەی هەنووکە چالاکە نووسراوە، وە لای ڕاستیش سێ دوگمەمان هەیە بەم شێوەیە :-

* Close :- بۆ داخستنی بەرنامەکە بەکاردێت کە هەمان کار بە ( Alt+F٤ ) یش دەکرێت.

* Maximize, Restore :- بۆ بچووککردنەوەو گەورەکردنەوەی پە نجەرەی بەرنامەکە لە سنووری شاشەکە .

* Minimize بۆ بچووککردنەوەی پە نجەرەکە بۆسەر Task bar کە بەشێوەی ئایکۆنێك دەردەکەوێت.

بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە پە نجەرەی My Computer بەشی یەکەمی ئەم کتێبەی بەردەستت.

## دووەم :- شریتی لیستەکان Menu Bar

لەم بەشەدا لیستی هەموو فەرمانە گرنگەکانی تیادایە بۆیە ناویشیان ناوە شریتی لیستەکان کە بەگشتی دوگمەی ئەم لیستانەی تێدایە : ( File, Edit, View, Insert, Format, Help ) .

سێهەم :- شریتی ئامرازەکان Tool Bar ئەم بەشەی بەرنامەکە کۆمەڵێك شریت دروست دەکات کە گرنگ ترین و گشتی ترینیان بریتیە لە :-

* شریتی ئامرازە پێوانەییەکان Standard Tool Bar .

* شریتی ئامرازەکانی ڕێکخستن و چاککردن Formatting Tool Bar.

## چوارەم :- ڕاستە Ruler

## پێنجەم :- شریتی زانیارییەکان Status Bar

## شەشەم :- شاشەی داغڵکردن Input Screen یان Windows Document



## لابردن وهێنانه سەر شاشەی شریتە جیاوازەکان:-

گونجاوە هەریەك لەو شریتانەی پێشەوە بشارینەوەو لابەین بۆ گەورەکردنی رووبەری کار لەشاشەی پیشاندان، دەتوانین بۆ سەلماندنی ئەم قسانە شاردنەوەی راستە Ruler وەك نموونە تاقی بکەیتەوە، بەم شێوەیە:-

١- کلیك لەسەر دوگمەی View بکە لەبەشی شریتی لیستەکان Menu Bar کە بەهۆیەوە لیستێکت بۆ دەکرێتەوە:-

٢- کلیك لەسەر بەشی Ruler بکە کە بەمەش ئەو هێمایەی بەردەمی نامێنێ کە نیشانەی ئەوەیە کە چالاکی نەماوەو بەمەش راستەکە لادەچێت، وە هەروەها بۆ لابردنی بەشەکانی Standard bar, Font bar, Tool bar بەهەمان شێوە.




## گۆرینی ئاراستەی نووسین:-

بێگومان دوو ئاراستەی نووسینمان هەیە، ئەوانیش لەچەپەوە بۆ راست، یان لە راستەوە بۆ چەپ کە بەگوێرەی پێویستی کارەکەمان و زمانی نووسینەکە ئاراستەکە دیاری دەکەین، بە نموونە ئەگەر ئاراستەی نووسین لە چەپەوە بۆ راست بێت بمانەوێت بیگۆڕین، ئەم هەنگاوانە دەنێین:-

١- پەنجە لەسەر دوگمەی Ctrl سەر Keyboard دابگرەو بێ ئەوەی پەنجەت لاببەیت پەنجەیەکی ترت بخەرە سەر دوگمەی Shift ی سەر کیبۆردەکە بەمەش ئاراستەی نووسین پێچەوانە دەبێتەوە بۆلای راست، دیارە ئەگەر (Ctrl+Shift,) ی لای راست بەکاربهێنین وە بە پێچەوانەوەو بە بەکارهێنانی کلیکی (Ctrl+Shift,)ی لای چەپ کارەکەمان پێچەوانە دەبێتەوە.

٢- وە بە پەنجەنان بە هەردوو Ctrl+Shift, زمانەکەمان بۆ ناگۆڕێت بۆیە پێویستە زمانی نووسین بگۆڕین بۆ زمانی عەرەبی.

## گۆڕینی زمانی نووسین:-

تا هەنووکە کۆمپانیای مایکرۆسۆفت کاری بۆ ئەوە نەکردووە کە نووسین بەزمانی کوردی بێتە بەشێك لە بەرنامەکانی و بێ هیچ گرفتێك نووسینی کوردی قبوول بکات بەڵام بۆ زمانی عەرەبی ئەوکارە کراوە بۆیە کە باسی گۆڕینی زمانەکان دەکەین تەنها ناوی زمانی عەرەبی و ئینگلیزی دەهێنین.

ئەگەر بەزمانی عەرەبی بنووسین ﴿الحب نصف الاول من الحياه... ونصف الپانی من الحياه (الحب)﴾و بمانەوێت بە زمانی ئینگلیزی نووسینەکەمان تەواوبکەین بۆ گۆڕینی ئاراستەی نووسین ئەوا ئەم هەنگاوانە جێبەجێ دەکەین:-

١- ئەگەر ئاراستەی نووسین لەچەپەوە بۆ ڕاست بوو ئەوا پێچەوانەی دەکەینەوە، وەك لە پێشەوە (گۆڕینی ئاراستەی نووسین) باسمانکرد، ئەوا ئەگەر لە ڕاستەوە بۆ چەپ بوو ئەو نووسینەی سەرەوە بێ هیچ دەستکارییەك دەنووسین:- (الحب...).

٢- بۆ گۆڕینی شێوەی زمانی نووسین بێ گۆڕینی ئاراستە پە نجە لەسەر دوگمەی Alt سەر کیبۆردەکە دابگرەو پاشان بێ ئەوەی پە نجە لاببەیت لەسەر Alt پە نجەیەکی دیکەت بنێ بە دوگمەی Shift دا بەم شێوەیە شێوازی زمانی نووسین دەگۆڕێت بۆ ئینگلیزی بێ ئەوەی ئاراستەی نووسینەکەمان بگۆڕێت، دیارە Alt, Shiftی لای چەپ بەکاردەبەیت. پاشان بنووسە (Can you love me if you love me alone, let me kiss your lip).

٣- بۆ دووبارە پێچەوانەکردنەوەی زمانی نووسین بۆ زمانی عەرەبی پە نجە بنێ بە دوگمەی Altی لای ڕاست و بێ ئەوەی پە نجەت لاببەیت پە نجەیەکی ترت بنێ بەدوگمەی Shiftی لای ڕاستی سەر کیبۆردەکە. دوای گۆڕانی زمانەکە بۆ جاری دووەم بنووسە: (قولی احبك كى تزيد وسامه... فبى غير حبك لا اكون جميلا).

## ڕاستکردنەوە لە نووسین:-

ئەگەر هەڵەیەکمان کرد لە نووسینێکدا ئەوا دەتوانین بەهۆی دوگمەی سڕینەوەی حەرفی Back Space ی سەر کیبۆردەکە ئەو هەڵەیە بسڕینەوە ئەگەر لە کۆتاییدا بوو، وە ئەگەر لەشوێنێکدا بوو کە تێپەڕ بووین بەسەریدا ئەوا کلیك لەسەر شوێنی بەردەم ئەو هەڵەیە دەکەین و پاشان بەهۆی Back Space دەیسڕینەوە.

## گۆڕینی شێوەی فۆنت Font

١- کلیك لەسەر بەشی گۆڕینی شێوەی خەتەکان بکە لە لیستی Formatting Tool Bar دا، وەك لە پێشەوە باسمانکرد.



٢- کلیك لەسەر شێوەیەك لە شێوەکانی خۆت بکە بەگوێرەی کارەکەت و بەخواستی خۆت.

٣- کلیك لەسەر بەشی نووسین بکەو چیت دەوێت بینووسە. ئێمە لێرەدا دەنووسین اطلب علم وله في الصين...

## * سەرنج:-

گۆڕینی شێوەی فۆنت تەنها لەسەرەتای کارکردن و پێش نووسینی کارەکەماندا ناکرێت بەڵکو دەتوانی دووا نووسراوەکەش ئەو کارە بکەین ئەویش بە سەلێکت کردنی ئەو نووسینەی کە نووسیومانە بەهۆی ماوسەکەوە، یان کیبۆردەکەوە یان سەلێکتی هەمووی بەهۆی Cntrl+Alt و پاشان هەڵبژاردنی جۆرێکی فۆنت وەك پێشتر باسکرا ئەوا دەبینیت نووسینەکەمان دەبێت بەو فۆنتەی کە هەڵمانبژاردووە.

**گۆڕینی حەجمی نوسین**

ئەو نووسینەی دەمانەوێت تایپی بکەین بە جۆرەها حەجم دەکرێت بە نموونە ئەگەر ویستمان حەجمی ئەونووسینەی پێشتر: (الحب نصف الاول...) بگۆڕین بۆ حەجمێکی تر ئەوا ئەم هەنگاوانە هەڵدەگرین:-

١- کلیك لەسەر سەهمی گۆڕینی حەجمی خەتەکان دەکەین کە لیستێکمان بۆ دەکرێتەوەو تیایدا حەجمێك بە پێی کارەکەمان هەڵدەبژێرین.




٢- ئێمە لێرەدا فۆنتی ٢٨ هەڵدەبژێرین تۆش کەیفی خۆتە.

٣- دەست بەنووسین بکە دەبینی بەو حەجمە بۆت دەنووسێت کە هەڵتبژاردووە.

## ڕێکخستنی ناونیشان

ئەگەر ناونیشانێکمان هەبێت و، دوای نووسینی لەسەر ڕووی شاشەکە بمانەوێت شوێنەکەی بگۆڕین، بە نموونە ناونیشانی کتێبی: Management information systems دەنووسین، ئەم هەنگاوانە دەنێین.

١- ئەگەر بمانەوێت لە ناوەڕاستدا بێت ئەوا کلیك لەسەر بەشی ناوەڕاست دەکەین لەناو بەشی Formatting Tool Barدا.

٢- وە ئەگەر بیگۆڕین و دەستکاریکردنی ئەو هەڵبژاردنەی پێشوو ڕستەیەکی نوێ بنووسین ئەوا لە ناوەڕاستدا بۆمان دەنووسێت.

ئەم فەرمانەیان بۆ گواستنەوەی ڕاستەکە بەرەو لای ڕاست بەکاردێ.

بەلام ئەم فەرمانەیان بۆ گواستنەوەی بەرەو لای چەپ بەکاردێت.



**گۆڕینی ڕەنگی فۆنت**

دەتوانین بە گوێرەی پێویست و حەزی خۆمان ڕەنگی ئەو خەتە دیاری بکەین کە پێی دەنووسین و کارەکانی پێ جێبەجێ دەکەین، بەهۆی بەجێگەیاندنی ئەم هەنگاوانەوە:-

١- کلیك لەسەر بەشی ڕەنگەکان بکە لەبەشی Formatting Tool Bar دا بەم شێوەیە:-




٢- یەکێك لەو ڕەنگانەی ئەو لیستە کلیك بکە کە بۆت کراوەتەوە.

٣- پاشان چ نووسینێکت هەیە بینووسە دەبینی بەو ڕەنگە بۆت دەنووسێ کە لە خانەی ٢دا هەڵتبژارد.

تۆخکردنی(قەڵەوکردنی) فۆنت و هێڵ بەژێردا هێنان و لارکردنەوەی Bold, Underline, Italic

١- دوگمەی گەورەکردنی خەت:

ئەم دوگمەیە بەکاردەهێنرێت بۆ گەورەکردن و تۆخکردنی ئەو خەتەی کە پێی دەنووسین و بە کلیك کردن لەسەری چالاك دەبێت.

وە بۆ پەشیمان بوونەوە لابردنی ئەو فەرمانە بۆ نووسینی ڕستەو پیتەکانی دواتر کلیك لەسەری دەکەینەوە بۆ جاری دووەم و بەمەش چالاکییەکەی نامێنێ.

٢- لارکردنەوەی پیتەکان ئەم دوگمەیە بەکاردەهێنرێت بۆ لارکردنەوەی پیتەکانی نووسینەکەمان و بە کلیك کردنی چالاك دەبێ و ئەمکارەمان بۆ بەجێدەگەیەنێت.

دەتوانین بە دووبارە کلیك کردن لەسەری کارو چالاکییەکەی نەهێڵین و لایببەین.

٣- هێڵ بەژێرداهێنان

ئەگەر کلیك لەسەر ئەم دوگمەیە بکەین ئەوا ئەو ووشەو ڕستانەی بۆمان دەنووسێت هێڵیان بەژێردا دەهێنێت.

بە دووبارە کلیك کردنەوە لەسەری لادەچێت و ئیدی هێڵی بەژێردا ناهێنێ.



## پەشیمان بوونەوە:-

ئەگەر بە هەڵە هێمایەکت سڕی یەوە، یان پیتێك ویان زیادەت نووسی ئەوا دەتوانیت لەم کارە پەشیمان ببیتەوەو سوود لە بەکارهێنانی دوگمەی Undo بکەیت لە لیستی Edit یان لەسەر Standard Tool Bar.




## سەیڤ کردن Save

بۆ پاراستنی ئەو کارانەی کە ئە نجاممان داوەو سەیڤ کردن و هەڵگرتنیان پێویستە ئەم هەنگاوانە بگرینەبەر:-

١- کلیك لەسەر Save لەبەشی فایلی شریتی Menu bar بکە یان لەسەر بەشی Save لە ستاندارد تولْ بارا دەبینی ئەم پە نجەرەیەت بۆ دەکرێتەوە.




٢- ناوێك بۆ فایلەکەت لەبەشی File Name ی پە نجەرەکەدا بنووسەو لەبەشی Save as type جۆری سەیڤ کردنەکە دیاری بکە.

٣- لەبەشی Save in دا شوێنی خەزنکردنی فایلەکەت دیاری بکە کە بە کلیك کردن لەسەر سەهمە بچووکەکەی تەنیشت لاکێشەی ناوەکان لیستێکت بۆ دەکرێتەوە بەم شێوەیە :-

ئەم لیستە پێکهاتووە لە :-

* Desk top :- بە کلیك کردن لەسەری ئەو فایلەی کە هەمانە سەیڤ دەبێت.

* (C:) :- درایڤی سی بە هەڵبژاردنی ئەم بەشە لە هاردی سی دا بۆت خەزن دەبێت.

* ٣,٥ Floppy(A:) :- بە هەڵبژاردنی ئەم بەشە لەناو فلۆپی دا بۆت خەزن دەبێت.

* My Document :- بە هەڵبژاردنی ئەم بەشە لە ناو بەشی دۆکیومێنتەکان و My Document بۆت سەیڤ دەبێت.

٤- لە دوای دیاریکردنی شوێنی سەیڤ کردنەکە کلیك لەسەر دوگمەی Save بکە بۆئەوەی فایلەکەت بۆ خەزن بکات بەگوێرەی ئەو مواصەفاتانەی لە خاڵەکانی پێشەوەدا دیاریت کردووە.




## کردنەوەی پەڕەیەکی نوێ

١- کلیك لەسەر ئامرازی نوێ New بکە. لەبەشی Standard Tool Bar دا، بەمەش ئەم پە نجەرەیەت بۆ دەکرێتەوە.

٢- کلیك لەسەر OK بکە بۆ بەجێگەیاندنی کارەکەمان.



### * سەرنج:-

هەندێ جارو بەگوێرەی فایلەکەی پێشوو ئەم پە نجەرەیەت بۆ دێتە سەر شاشە:-

کە دەڵێت ئایا سەیڤی گۆڕانەکان دەکەیت بۆ دۆکیومێنتەکەت؟ وە لە وەڵامدا دەتوانیت خۆت یەکێك لەو سێ فەرمانە کلیك بکەیت:-

* Yes:- بەڵێ

* NO:- نەخێر

* Cancel:- پەشیمان بوونەوە لە فەرمانەکە.

## کردنەوەی لاپەڕەیەکی سەیڤ کراو

بۆ کردنەوەی لاپەڕەیەکی خەزنکراو، ئەم هەنگاوانە بەجێبگەیەنە:-

١- کلیك لەسەر دووگمەی fileبکە، کە بەشێکە لە شریتی لیستەکان menu barو پاشان کلیك لەسەر دوگمەی openبکە لەو لیستە نوێ یەدا کەبۆت دەکرێتەوە ، بەمەش ئەم پە نجەرەیەت بۆ دەکرێتەوە:-




٢- لە بەشی Look in پە نجەرەکەی سەرەوەدا شوێنی سەیڤ کردنەکە دیاری بکەو پاشان کلیك لەسەر ئەو دۆکیومێنتە بکە کە دەتەوێت بیکەیتەوە.

٣- کلیك لەسەر فەرمانی Open بکە، یان Enter بکە، وەیان دەتوانین لە خاڵی ٢و١دا لەجیاتی کلیك، دووانە کلیك بکەیت بەمەش یەکسەر فایلەکەت بۆ دەکرێتەوە. بێ ئە نجامدانی خاڵی سێهەم.

## چاپ کردن:-

بۆ چاپ کردنی ئەو فایلانەی هەمانەو کارمان پێیەتی دوای کردنەوەی فایلەکە دەچینە سەر هێمای Print .
لەسەر Standard Tool Bar و کلیکی لەسەر دەکەین.یان کلیك لەسەر fileدەکەین لە menu barدا، پاشان کلیك لەسەر دووگمەی printدەکەین:



## شریتی لیستەکان Menu Bar

شریتی لیستەکان لە ٦ دوگمە پێکهاتووە کە بە کلیك کردنی هەر دوگمەیەکیان لیستێك دەکرێتەوە وەك ئاماژەمان پێدا هەر لەبەر ئەوەشە بە شریتی لیستەکان ناسراوە، وەلێ بە پێویستی نازانم زۆر بە ووردی باسی هەر لیستەیان بکەم بۆیە تەنها ئاماژە بە لیستەکەو پێکهاتەی لیستەکە دەکەم. بە ڕوونکردنەوەیەکی کەم بەم شێوەیە :-




یەکەم :- فایل File

بە کلیك کردنی ئەم دوگمەیە لیستێکمان بۆ دەکرێتەوە کە لەچەند فەرمانێك پێکهاتووە بەم شێوەیە :-

١- New :- بەکاردێت بۆ کردنەوەی لاپەڕەیەکی نوێ بۆ کارکردن و چالاك بوونی بۆ تایپ کردن.

٢- Open :- بەکاردێت بۆ کردنەوەی دۆکیومێنتێکی سەیڤ کراو، وەك لە پێشەوە بە تەواوی ڕوونمان کردەوە.

٣- Save :- بەکاردێت بۆ خەزن کردن وسەیڤ کردنی ئەو فایلەی تایپمان کردووە، لە پێشتر ڕوونمان کردۆتەوە.

٤- Save as :- وەکو فەرمانی خاڵی سێ وایەو بۆ سەیڤ کردنی فایل بەکاردێت بۆ جارێکی ترو بە ناوێکی نوێوە.

٥- Print :- بۆ پرینت کردنی واتە چاپ کردنی ئەو پەڕەیەی تایپمان کردووە.

٦- Print preview :- بۆ پیشاندانی لاپەڕەکان بەرلە چاپکردنیان بۆئەوەی بزانین لە چاپدا چۆن دەردەچێت و پێویستی بە دەستکاری هەیە یان نا؟

٧- Page Setup :- بۆ ڕێکوپێك کردنی لاپەڕە بەکاردەبرێت.

٨- Send :- بۆ ناردنی ئەوەی تایپمان کردووە بۆ بەشێکی دیاریکراوی پەیوەست بە بەرنامەکەوە کە بریتییە لە : Untiled-Message (HTML)

٩- Exit :- بە کلیك کردنی بەرنامەکە دادەخرێتەوەو لەسەر ڕووی شاشەکە لادەچێت.




## دووەم :- Edit

پێکهاتووە لەم بەشانەی خوارەوە کە هەریەکەو بەکارهێنانێکی گرنگی هەیە، کە بەکورتی باسی بەکارهێنەکەی دەکەین و چۆنیەتی بەکارهێنەکەشی جێدەهێڵین بۆ فێرخواز هەتاوەکو خۆی تاقی بکاتەوەو کارکردنەکەی فێر ببێت. چونکە بەرنامەیەکی زۆر پێویست و گرنگ نی یە :-

١- Undo :- بە مەبەستی پەشیمان بوونەوە کلیك لەسەری دەکرێت.

٢- Cut :- بۆ بڕینی بەشێکی سەلێکت کراو (هەڵبژێردراو-Select) .

٣- Copy :- بۆ لەبەرگرتنەوەی بەشێکی سەلێکت کراو کلیکی لەسەر دەکرێت.

٤- Past :- بۆ دانانەوەی ئەو بەشەی کە بە خاڵی دووەم بڕیوومانە یان بەهۆی خاڵی سێهەمەوە لەبەرمان گرتۆتەوە بەکاردەهێنرێت.

٥- Past Special :- دانانەوەی تایبەتی، وەکو خاڵی چوارەم وایە لە کارکردندا.

٦- Clear :- بەکاردەهێنرێت بۆ سڕینەوەی بەشێکی سەلێکت کراو، پاککردنەوەی.

٧- Select All :- بۆ دیاریکردن و هەڵبژاردنی هەموو نووسین و وێنەی سەر شاشەکە بەکاردەهێنرێت، کە زۆربەی بەکارهێنەرانی کۆمپیوتەر بە ڕەشکردنی گشتی ناوی دەبەن بەمەش ئەو بەرەیە ئامادە دەبێت بۆ بەجێگەیاندنی هەردوو فەرمانی خاڵی دووەم و سێهەم.

٨- Find :- بۆ مەبەستی دۆزینەوەی وشەیەك، پیتێك، شتێك بەکاردێت لەناو لا پەڕەی چالاکی بەردەستدا.

٩- Find Next :- وەکو خاڵی ٨ وایە.

١٠- Replace :- بەکاردێت بۆ مەبەستی لەجیاتی دانان.

١١- Links :- بۆ مەبەستی لینك بەکاردەهێنرێ.




## سێهەم:- View

ئەم فەرمانە بە کلیك کردنی چالاك دەبێت و لیستێك دەهێنێتە سەر شاشەکە پێکهاتووە لە (Status bar- Ruler- Format bar- Tool bar) کە بە کلیك کردنی هەر یەکەیان هێمای سەحێك لەبەر دەمیا دروست دەبێت و فەرمانەکانی پەیوەندیدار بەو بەشەی کە کلیك- مان کردووە لەسەر شاشەکەو لە بەشی Toolدا دەردەکەوێت، وە بە پێچەوانەشەوە لادەچێت.

وە فەرمانی Option کە دەکەوێتە کۆتایی لیستەکەوە بۆ مەبەستی هەندێك هەڵبژاردن بەکاردەهێنرێت.



## چوارەم:- Insert

بە مەبەستی دانانی دوو فەرمان بەکاردەهێنرێ. ئەویش:-

١- Date and Time: دانانی ڕۆژ و بەروار.

٢- Object: دانانی تەنێك.




## پێنجەم:- Format

ئەم بەشەش لە سێ فەرمان پێکهاتووەو فەرمانی (...Font بۆ کاروباری خەت و گۆڕان تیایدا) وە فەرمانی (Bullet Style بۆ دانانی هێمایەك لە سەرەتای هەموو دێڕێکی نووسیندا.) و فەرمانی (Paragragh بۆ کاری پەرەگرافی) بەکاردەبرێت.




## شەشەم:- Help

لە دوو بەش پێکهاتووە ئەوانیش (Help topic) و (about word pad) کە دەتوانرێت بۆ فێربوونی بەرنامە واتە Word pad سوودی لێوەربگیرێت.



# بەشی شەشەم

# بەرنامەی وێنەکێشی




# Paint

بەرنامەی وێنەکێشی Paint یەکێکە لەبەرنامە گرێدراوەکانی سیستەمی Windows XP کە خزمەتگوزاری لە وێنەی شێوەکان پێشکەش دەکات، کە سەرەتا باسی کارکردنی بەرنامەکە دەکەین، بەلاّم ڕێگەی کارپێکردنی ئەم بەرنامەیە تازە نییەو تا ڕادەیەك هەمان ڕێگەو شێوەی بەرنامەی نووسین -Word pad– ە، کە لە پێشەوە باسمانکرد بۆ کارپێکردنی بەرنامەکە ئەم هەنگاوانە هەڵبگرە :-

١- کلیك لەسەر دوگمەی دەستپێکردن Start بکە کە دەکەوێتە سەر Task bar.

٢- هێمای ماوسەکە ( سەهمەکە ) ببەرە سەر بەشی هەموو بەرنامەکان All Program کە بەهۆیەوە لیستێکت بۆ دەکرێتەوە بەم شێوەیە :-

٣- بچۆرە سەر Accessories و بەرنامەی Paint کلیك بکەو هەڵیبژێرە.

بەمەش بەرنامەکەمان بۆ دەکرێتەوە وەك لەسەرەوەدا دیارە.




دیارە جگە لەم ڕێگەیە بەڕێگەی تریش دەتوانین بچینە ناو بەرنامەکەوە:-

* بچۆرە سەر کورتکراوەی بەرنامەکە Short cut و دووانە کلیکی لەسەر بکە یان کلیکی ڕاستی لەسەر بکەو پاشان کلیکی OK بکە لەو لیستەدا کە بەهۆی کلیکی ڕاستەوە بۆمان کراوەتەوە.

## ئامڕازە جیاوازەکانی وێنە

١-ئەم هێما شێوە ئەستێرەییە بۆ دیاری کردن و سەلێکت کردن بەکار دەهێنرێت.

٢-هەروەها ئەم هێما شێوە لاکێشەییەش هەر بۆ سەلێکت کردن و دەستنیشانکردنی بە شێك بەکاردەهێنرێت.

٣- ئەم لاستیکە بۆ مەبەستی سڕینەوە بەکاردێت.

٤- بۆ ڕەنگ کردنی شێوەکان بەکاردێت. کلیکی لەسەر بکە، پاشان ڕەنگێك هەڵبژێرە، وەپاشان سەهمی ماوسەکە ببە سەر شێوەکەو کلیکی لەسەر بکە بۆ ڕەنگ کردنی.

٥-بۆ هەڵگرتنی ڕەنگی بەشێك بۆ ئەوەی بەکاربهێنیتەوە.

٦-بۆ گەرەکرن و بچوککردنەوەی لا پەرەکەی بەردەستت.

٧-ئەم قەڵەمە بۆ نووسین بەکار دەهێنرێت.

٨-ئەم فڵچەیە بۆڕەنگ کردن بەکاردەهێنرێت.

٩-ئەم پەمپە بۆ بۆیاخ کردن بەکار دەهێنرێت.

١٠-ئەم هێمای پیتی ئەیە Aبۆ دیاری کردن و چالاککردنی ناوچەو بەشی نووسین بەکاردەهێنرێت.



١١-بۆ کیشانی پارچە ڕاستە هێڵ بەکاردەهێنرێت.

١٢- بۆ وێنەکێشانی چەماوەیی.

١٣- بۆ وێنەکێشانی شێوەی لاکێشەی بەکاردەهێنرێت.

١٤-بۆ وێنەی نارێك.

١٥-بۆ وێنەی هیلکەی

١٦-بۆ وێنەکیشان .

## سەیڤ کردن :-

بۆ هەڵگرتن و پاراستنی ئەو کارەی کردوومانە ئەم هەنگاوانە دەگرینەبەر:-

١- کلیك لەسەر دووگمەی File بکە لە شریتی Menu bar–دا دەبینی لیستێکت بۆ دەکرێتەوە بەم شێوەیە :-

٢- لەو لیستەدا کلیك لەسەر دووگمەی Save بکە یان ( Save as ) و بەمەش ئەم پە نجەرەیەت بۆ دەکرێتەوە:-




لەبەشی Save in دا شوێن سەیڤ کردن دیاری بکەو لەبەشی File name دا ناوێك بۆ کارەکەت دابنێ بە نموونە من دەنووسم (hemin) .

٣- كلیك لەسەر دووگمەی Saveبکە بۆ بەئە نجام گەیاندنی کارەکەو هەڵگرتنی ئیشەکەمان بۆئەوەی جارێکی دیکە سوودی لێوەربگرین.




دروستکردنی وێنە بۆ باكگراوەندی ڕووی شاشە ئەو وێنەیەی پێشتر دروستمان کرد یان هەر وێنەیەکی تر دەتوانرێت بەشێوەیەك هەڵبگرێت و پاشگری بۆ دابنرێت کە ڕاستەوخۆ ببێتە باكگراوەندی ڕووی شاشە بەم شێوەیە :-

١- دوای دروستکردن و ئامادەکردنی وێنەکەت بچۆرە سەر Set as Background لە لیستی File لە شریتی لیستەکان Menu bar داو كلیكی لەسەر بکە.

٢- ئێستا لە بەرنامەی وێنە دەرچۆ دەبینی بۆتە باكگراوەندی ڕووی شاشەکە.

## کردنەوەی وێنەی سەیڤ کراو:-

ئەو وێنەیەی کە پێشتر سەیڤمان کرد، ئەگەر پێویستمان پێی بێت و بمانەوێت بیگێڕینەوە بۆ سەر شاشەی بەرنامەکە. ئەم هەنگاوانە ئەنجام دەدەیت:-

١- بچۆرە سەر دووگمەی فایل و کلیکی لەسەر بکە:-




٢- بچۆرە سەر دووگمەی Open کلیکی لەسەر بکە:-

٣- ئەو فایلە هەڵبژێرە کە پێشتر خەزنمان کرد بەناوی (hemin) و پاشان کلیك لەسەر دووگمەی Open بکەن، یان یەکسەری دووانە کلیك Double click لەسەر ناوی وێنەکە بکە.



# لیستەکانی بەرنامەی وێنەکێشی Paint :-

بێگومان بەرنامەی وێنەکێشیش وەك هەر بەرنامەیەکی تر چەند لیستێکی هەیە کە بە چەند دووگمەیەك لەسەر شریتی لیستەکان Menu bar ڕیزکراون و بە کلیك کردنیان دەکرێنەوەو لیستەکەیان دەردەکەوێت.




بۆیە زۆر بەکورتی ئاماژە بە دووگمەی ناو ئەم لیستانە دەدەین و تەنها باسی بەکارهێنانەکەی دەکەین و چۆنێتی بەکارهێنان و کارکردن تیایدا جێدەهێڵین بۆ فێرخواز تا خۆی تاقی بکاتەوەو ئاشنا ببێت پێی، بەم شێوەیە :-

## یەکەم :- File

ئەم لیستە لە چەند فەرمانێکی جیاواز پێکهاتووە کە پەیوەندییان بە فایلەکانەوە هەیەو کارکردنیان تاڕادەیەك وەك لیستی فایلی بەرنامەکانی ترە، بەم شێوەیە باسیان دەکەین :-

١- New :- بەکاردەهێنرێت بۆ کردنەوەی لەوحەیەکی نوێ.

٢- Open :- بەکاردێت بۆ کردنەوەی وێنەیەکی سەیڤ کراو.

٣- Save :- بەکاردێت بۆ سەیڤ کردن و هەڵگرتنی وێنەکان کە کارمان تیا کردووە ئامادەمان کردووە.

٤- Save as :- وەك خاڵی سێهەم وایەو هەمان کاردەکات.

٥- Print Preview :- بەکاردێت بۆ پیشاندانی ئەوکارەی کردوومانە بەرلەوەی چاپی بکەین بۆئەوەی بزانین لە چاپدا چۆن دەردەچێت.

٦- Page Setup :- بەکاردێت بۆ ڕێکوپێککردنی پەیجەکەی ( لاپەڕە )کەی بەردەستمان.

٧- Print :- بەکاردێت بۆ چاپکردن.

٨- Exit :- بەکاردێت بۆ دەرچوون لە بەرنامەکە.



## دووەم:- Edit

ئەم بەشەش، لیستێکە کە چەند دووگمەیەکی تایبەت بە کارکردنی هەنووکەیی تیادایەو هەریەکەو گرنگی خۆی هەیە بۆیە تەنها ئاماژە بە فەرمانەکانیان دەدەین بەم شێوەیە:-

١- Undo:- بۆ پاشگەزبوونەوە لە دواهەمین کردار بەکاردێت.

٢- Repeat:- بۆ مەبەستی دووبارەکردنەوەی شتێك بەکاردێت.

٣- Cut:- بۆ مەبەستی بڕینی شتێکی دیاریکراو ( لە پێشەوە باسی چۆنیەتی دیاریکردن کراوە ).

٤- Copy:- بۆ کۆپیکردنی شتێکی دیاریکراو بەکاردێت و نووسخەیەکی نوێمان بۆ لەبەر دەگرێتەوە.

٥- Past:- بۆ دانانەوەی بەشێکی دیاریکراوی بڕاو یان کۆپی کراو بەکاردێت.

٦- Clear Selection:- بۆ سڕینەوەو پاککردنەوەی بەشی دیاریکراو.

٧- Select All:- بە مەبەستی دیاریکردنی پێکهاتەی ناو پەیجەکە هەمووی بەکاردەبرێت.

٨- Copy to..:- بۆ مەبەستی (کۆپی بۆ...) بەکاردەکرێت واتە کۆپی کردن بۆ شوێنێکی دیاریکراو.

٩- Past From:- بۆ مەبەستی دیاریکردنی شوێنی دانان بەکاردێت.




## سێهەم:- View

لەم بەشەدا هەموو ئەو فرمانانە هەیە کە پەیوەندی بە بواری پیشاندانەوە هەیە، بەم شێوەیە:-

١- Tool box:- ئەم بەشە بە کلیککردنی چالاك دەبێت و سندوقی ئامرازەکان دەکرێتەوە.

٢- Color box:- سندوقی ڕەنگەکانەو تایبەت بە هەڵبژاردنی ڕەنگیی.

٣- Tex tool bar:- دەقی شریتی ئامرازەکان دەگرێتەوە.

٥- Zoom:- تایبەتە بە شاشەو پیشاندان کە پێنج شێوەی هەیە، ئەوانیش حەجمی ئاسایی واتە: Normal Size، وە حەجمی گەورە، واتە: Large Size و Castum و پیشاندان Show Grid و Show thumbnail.

٦- View:- پیشاندان.



## چوارەم:- Image

بەشەکانی تایبەت بە وێنە لەخۆ دەگرێت، کە ئەم فەرمانانەی خوارەوە:-

١- Flipe\ rotate :- بۆ مەبەستی سوڕانەوەی وێنەکە بەکاردەبرێت.

٢- Stretch\ skew :- بۆ کشاندن سوودی لێوەردەگیرێت.

٣- Invert\ color :- بۆ لابردنی ڕەنگ بەکاردەهێنرێت.

٤- هەروەها فەرمانەکانی Attributes و Clear و Image و Draw opaque بەشێکن لەم لیستە.




## پێنجەم:- Color

ئەم بەشە تەنها یەك فەرمان لەخۆ دەگرێت ئەویش پەیوەندیدارە بە چاککردن و ڕێککردنی ڕەنگەوە، واتە: Edit color .




## شەشەم:- Help

دوو بەش لەخۆ دەگرێت کە تایبەت بە پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری یارمەتیدان بۆ بەکاربەر ئەوانیش Help topic و about - paint کە بەکارهێنەر دتوانێت بۆ فێربوونی Paint( پەینت ) سوودی لێوەربگرێت.



گۆرانی هونەرمەندانی جیهانی لە سیدی MP٣ جێگەی بایەخە لەم سەردەمەدا، کە بەکارهێنەری کۆمپیوتەر دەتوانێت لەکاتی کارکردنیدا لەسەر ئامێرەکە سوودی لێوەربگرێت و سێدییەك بەدڵی خۆی گوێ لێبگرێت و کاری پێبکات، بۆ ئەم مەبەستە دەتوانیت سوود لە بەرنامەی Media Player وەربگریت کەلەگەڵ Windows$^{XP}$ دایەو بەهۆی ئەم هەنگاوانەوە ئەم کارە دەکەیت:-

١- فەرمانی Windows Media Player کلیك بکەو هەڵیبژێرە لەناو کۆمەڵەی هەڵبژاردنی Enter tainment دا لە لیستی گرێدراوی Accessories دا




بەهۆیەوە ئەم پەنجەرەیەت بۆ دەکرێتەوە، کە بەرنامەکەیە:-




وەیان دەتوانیت لەرێگەیەکی خێراترەوە بەرنامەکە کارپێبکەیت بەهۆی بەرنامەی Media Player لەسەر شریتی Quick lannch ی سەر شریتی تاسك Task bar بەم شێوەیەی خوارەوە:-



٢- كليك لەسەر Open بكە لە ليستی File دا بۆ هەڵبژاردنی گۆرانییەكان بۆ ئیش پێكردنیان:-



ئەم پە نجەرەیەت بۆ دەردەكەوێت.



دەتوانیت ئێستا ئەو گۆرانییە لەو پە نجەرەیەی سەرەوە هەڵبژێرێت كەدەتەوێت بیكەیتەوەو كلیكی لەسەر بكەیت.

٣- دوای ئەوەی كلیكت لەسەر گۆرانییەكە كرد كلیك لەسەر Open بكە. گۆرانییەكەت دەست بەكاردەكات و شێوەی بەرنامەی Media Player بەم شێوەیەی خوارەوە لێدێت.

دەگونجێت زیاتر لەگۆرانییەك هەڵبژێریت بە پە نجە داگرتن لەسەر كلیكی Ctrl لەماوەی هەڵبژاردنی پاشان كلیك كردن لەسەر Open.

## گۆڕینی شێوەی بەرنامەكە

دەگونجێت گۆڕان لەشێوەی بەرنامەكەدا بكەیت و بیگۆڕیت بەشێوەیەكی ترو كورت ترو جوانتر لەرێگەی هەڵبژاردنی Skin chooser لە شریتی ئامرازەكانی لای چە پی بەرنامەكە




کۆمەڵێك شێوە دەبینیت کە دەگونجێت شێوە کۆنەکەی پێ لابەرین و بیگۆڕین بەم شێوە نوێیەك-

بەهۆی دووانە کلیك کردن Double click لەسەر ناوی شێوەکان ئەنجامدەدرێت.

شێوەی بەرنامەکە دەگۆڕێت بۆ ئەم شێوەیە :-




Media Player و ... گرتەی ڤیدیۆیی

دەتوانرێت بەهۆی بەرنامەی میدیا پلەیەرەوە Media Player گرتەی ڤیدیۆیی کارپێبکەین و ببینین، بەهۆی ئەم هەنگاوانەوە:-

١- بەرنامەی Windows Media Player لەناو کۆمەڵە هەڵبژاردنی Enter tainment دا هەڵبـژێرە و کلیکـی لەسـەر بکـە کـە دەکەوێتە لیستی بەرنامە گرێدراوەکانی ویندۆ Accessories :-

٢- کلیك لەسەر فەرمانی Open بکە لە لیستی File ی بەرنامەکە :-

بەهۆیەوە ئەم پە نجەرەیەت بۆ دەکرێتەوە:-

٣- گرته ڤیدیۆییه‌كه دیاری بكەو كلیكی له‌سه‌ر بكه :-
٤- دوای دیاریكردنی گرته ڤیدیۆییه‌كه كلیك له‌سه‌ر Open بكه.
سه‌رنجــــــــــــــ :-
وێنه‌كانی ئه‌م چوار هه‌نگاوه‌ی سه‌ره‌وه هه‌ر هه‌مان وێنه‌كانی پێشتره بۆیه به‌ پێویستمان نه‌زانی دایانبنێینه‌وه.

## گه‌وره‌كردنی Media Player ... پڕاوپڕی شاشه

بۆ گه‌وره‌كردنی به‌رنامه‌ی میدیا پلەیەر بۆ ئه‌وه‌ی هه‌موو شاشه‌كه بگرێته‌وه ده‌توانیت كلیك له‌سه‌ر به‌شی View ی به‌رنامه‌كه بكه‌یت و پاشان سه‌همی ماوسه‌كه ببه‌یته‌سه‌ر دووگمه‌ی Full Screen و كلیكی له‌سه‌ر بكه‌یت به‌مه‌ش به‌رنامه‌كه‌ت بۆ گه‌وره ده‌كات:



میدیا پلەیەر بگێڕێته‌وه بۆ هه‌مان حه‌جمی خۆی به‌هه‌مان ڕێگه. وه ده‌توانیت ئه‌م شێوه گۆڕانه به‌هۆی هه‌ردوو دووگمه‌ی ( Alt+Enter ) له‌سه‌ر كیبۆرده‌كه جێبه‌جێ بكه‌یت.

## گۆڕانكاری له‌حه‌جمی ده‌نگدا Sound Volume

ده‌توانیت حه‌جمی ده‌نگی زیاد یان كه‌م بكه‌یت به‌م شێوه‌یه :-
١- به‌هۆی سه‌همی ماوسه‌كه‌وه بچۆره سه‌ر هێمای مایكریفۆن له‌سه‌ر به‌شی ڕاستی Task bar و دووانه كلیكی له‌سه‌ر بكه كه‌به‌هۆیه‌وه به‌شی حه‌جمی ده‌نگت بۆ ده‌كرێته‌وه به‌م شێوه‌یه :



٢- به‌هۆی سه‌همی ماوسه‌كه‌و كلیك كردنه‌وه ده‌نگه‌كه زیاد و كه‌م بكه، بۆ ( سه‌ره‌وه ) ده‌نگه‌كه زیاد ده‌كات وه بۆ ( خواره‌وه ) ده‌نگه‌كه كه‌م ده‌كات. به كلیك كردن له‌ناو چوارگۆشه‌ی به‌رده‌م Mute ده‌نگ نامێنێ كه به‌دووباره كلیك كردن له‌سه‌ری لاده‌چێت و ده‌نگه‌كه ئاسایی ده‌بێته‌وه.
* ئه‌گه‌ر هێمای مایكریفۆن mic له‌سه‌ر شریتی Task bar نه‌بوو ده‌توانیت به‌هۆی ئه‌م هه‌نگاوانه‌ی خواره‌وه بۆی دابنێیت:-
١- كلیك له‌سه‌ر My Computer بكه‌و به‌یه‌كێك له‌ ڕێگاكان بیكه‌ره‌وه:-
* كلیكی ڕاستی له‌سه‌ر بكه‌و پاشان كلیك له‌سه‌ر Open بكه له‌و لیسته‌ی كه‌بۆت ده‌كرێته‌وه ئه‌مه ئه‌گه‌ر به‌شێوه‌ی كورتكراوه Short cut له‌سه‌ر ڕووی شاشه‌كه My Computer –مان هه‌بوو.

* ئەگەر Short cut –مان هەبوو لەسەر ڕووی شاشەکە Desk top (دەبل کلیک دووانە کلیک – Double click ) بکە لەسەری بۆئەوەی بۆتبکرێتەوە.

* یان بەهۆی دووگمەی دەستپێکردن Start و پاشان کلیک لەسەر My Computer بکە.




٢- کلیک لەسەر Control panel بکە لەبەشی لای چەپی پەنجەرەی My Computer .




ئەوا ئەم پەنجەرەیەت بۆ دەکرێتەوە کە پەنجەرەی لەوحەی دەست بەسەراگرتنە Control panel .




٣- دووانە کلیك لەسەر بەشی Sound and Audio Devices بکە کەتایبەتە بە دەستبەسەراگرتنی دەنگی.




٤- بۆئەوەی هێمای میکریفۆنەکەت لەسەر بەشی Task bar بۆ دابنرێت کلیك لەناو چوارگۆشەی بەردەم Place volume icon in the task bar ، کە تایبەتە بەم کارە.

**وە دەگونجێت دەست بەسەراگرتنی دەنگی بەهۆی ئەم خاڵانەی خوارەوە ئەنجام بدرێت:-**

١- فـەرمانی Volume control لـە کۆمەڵـەی هەڵبـژاردنی Entertainment ی لیـستی بەرنامـە گرێـدراوەکانی ویندۆس Accessoriesدا کلیك بکەو هەڵیبژێرە




ئەم پە نجەرەیەت بۆ دەردەکەوێت.



# بەشی هەشتەم

# تاسك باڕ




# Task Bar

## گۆڕینی شوێنی Task bar

دوای كارپێكردنی بەرنامەی مایكرۆ سۆفت Windows XP شریتی Task لەبەشی خوارەوەی ڕووی شاشەكە دەردەكەوێت كـە دەتوانیـت گۆڕان لە شوێن و شێوەكەشیدا بكەین كە لێرەدا باس لەگۆڕانی شوێنەكەی دەكەین، بەم شێوەیە :-

١- سەهمی ماوسەكە ببەرە سەر Task bar.

٢- پاشان كلیكی ڕاست لەسەر ئەو شوێنە بكە كە بەمەش لیستێكت بۆ دەكرێتەوە.

٣- كلیك لەسەر Lock the task bar بكە بەمەش تاسك باڕ لۆك دەبێت و دادەخرێت.و ڕێگەت پێنادات بیگوێزیتەوە.



٤- جارێكى تر بچۆرەسەر Task bar وكليكى ڕاستى لەسەر بكەو ، پاشان كليكى lock the task bar بكەو هێماى سەحەكەى لەسەر لاببە.

٥- دواتر پە نجە لەسەر كليك دابگرەو Task bar ڕابكێشە بەرەو يەكێك لە لاكانى ڕووى شاشەكە بەخواستى خۆت.




## گۆڕينى حەجمى Task Bar

بێگومان ئەگەر كۆمەڵێكى زۆر پە نجەرە بچووك بكەينەوە Minimize بۆسەر Task bar قەرەباڵغى يەكى زۆر دروست دەبێت وە ئەگەر تێبينى بكەيت ئايكۆنەكانى سەر Task bar بەشێوەى بچووك دەركەوتوون بەهۆى قەرەباڵغيانەوە جا بۆ ئەوەى بەشێوەيەكى گەورەو ڕێك و پێك دەركەوون دەتوانيت ئەم هەنگاوانە جێبەجێ بكەيت:-

١- سەهمى ماوسەكە ببەرە سەر قەراغى Task bar و تێبينى بكە كە سەهمى ماوسەكە دەگۆڕێت بۆ پارچە ڕاستەهێڵێكى دوو سەر.

٢- پە نجە لەسەر كليك دابگرە بەئاڕاستەى سەرەوەى ڕووى شاشەكە سەهمى ماوسەكە بجوڵێنە.

٣- شێوەى پانى Task bar دەگۆڕێت و گەورە دەبێت بەم شێوەيە:-

سەرنجـــــــــ:-

لەبارى لۆك كردن وداخستنى تاسك باڕدا lock the taskbar ناتوانين ئەم كارەجێبەجێبكەين،بۆيە پێويستە تاسك باڕ لۆك نەبێت و سەحەكەى بەردەمى لاببەين وەك لە گواستنەوەى تاسك باڕدا باسمانكرد لەسەرەوە



# گۆڕینی تایبه تمەندییەکانی Task bar و Task menu

## یەکەم:- Task bar:

لە Task bar دا دەگونجێت هەندێك تایبە تمەندی گۆڕانی بەسەردا بکرێت، کە لەڕاستیدا گۆڕانی ڕووکەشییە کە ئەم کارەش بەهۆی ئەم خاڵانەوە دەبێت:-

١- سەهمی ماوسەکە ببەرە سەر Task bar و کلیکی ڕاستی لەسەر بکە، کە بەهۆیەوە ئەم لیستەت بۆ دەکرێتەوە:-




٢- کلیك لەسەر فەرمانی Properties بکە، بەمەش پە نجەرەی تایبەت بەگۆڕانی تایبە تمەندییەکانت بۆ دەکرێتەوە.

٣-لەبەشی سەرەوەی پە نجەرەکەدا بەشی Task bar چالاکە بەشێکی گرنگەو لەم فەرمانانەی خوارەوە پێکهاتووە:-




### * داخستنی Task bar

بە کلیك کردن لەناو چوارگۆشەی بەردەم ئەم فەرمانە تاسك باڕ دادەخرێت و ناتوانرێت بگوێزرێتەوە یان گۆڕان لە قەبارەکەیدا بکرێت بە هیچ شێوەیەك، بەم شێوەیە ئەم فەرمانە چالاك دەبێت، وە بە دووبارە کلیك کردنەوە لەسەر چوارگۆشە بچووکەکە نیشانەی ڕاست لادەچێتەوەو کارەکە پێچەوانە دەبێتەوە.

### * شاردنەوەی خۆیی Auto-hide the task bar

بە کلیك کردن لەسەر چوارگۆشە بچووکەکەی بەردەم ئەم فەرمانە تاسك باڕ بەشێوەیەکی خۆیی دەشارێتەوەو دیار نامێنێت تەنها لەو کاتانەدا نەبێت کە سەهمی ماوسەکە لەشوێنەکەی نزیك دەکەینەوە، کە بەمە دەردەکەوێتەوەو دەتوانین چ کارێکمان هەیە بە ئەنجامی

بگەیەنین، وە بە دووبارە کلیك کردنەوە لەسەر چوارگۆشە بچووکەکە، کە بەمەش هێمای ڕاست ( √ ) لەناو چوارگۆشە لادەچێت فەرمانەکە چالاکییەکەی نامێنێت.

* پاراستنی تاسك بارِ لەسەر ویندۆس Keep task bar on top of other windows

بەهۆی کلیك کردن لەسەر ( لەناو ) چوارگۆشە بچووکەکەی بەردەم ئەم فەرمانە کاری پاراستنی تاسك بارِ لەسەر ویندۆس بە ئە نجام دەگات و بەمەش Task bar ناشاردرێتەوەو وەك خۆی دەمێنێتەوە.

* کۆکردنەوەی پە نجەرە کراوەکان لە لیستێکدا Group similar task bar buttons

دەتوانیت لە یەك کاتدا زیاتر لە ( ٦ ) شەش پە نجەرە بکەیتەوە، بەڵام کە بچووکیان دەکەیتەوە Minimize هەریەکەو بەشێوەی ئایکۆنێك بەشێوەی سەربەخۆ دەردەکەوێت.

بەڵام ئەگەر کلیکی ئەم فەرمانەمان کردو ( سەحێك )ماندا لە چوارگۆشەی بەردەم فەرمانەکەدا، ئەوا فەرمانەکە چالاك دەبێت و پە نجەرە کراوەکان دەچنە لیستێکەوە، بەڵام هەر لەسەر taskbar

وە ئەم فەرمانە چالاك نابێت تا ئەوکاتەی ژمارەی پە نجەرە کراوەکان زۆر نەبن.

بە کلیك کردن لەسەر ئەو ئایکۆنە نوێیەی دروست دەبێت پە نجەرە کراوەو چالاکەکان لەشێوەی لیستێکدا دەردەکەون.

سوودێکی ئەم فەرمانە ئەوەیە کە دەتوانرێت هەموویان پێکەوە دا بخرێن Close. چونکە دەبنە یەك گروپی دیاریکراو، ئەویش بە کلیك کردن لەسەر شوێنێکی چۆڵی Task bar دیارە کلیکی ڕاست کردن نەك کلیکی چەپ، کە بەهۆیەوە ئەم لیستەت بۆ دەکرێتەوە.

کلیك لەسەر فەرمانی close group بکە بۆ داخستنی هەموو پە نجەرەکان پێکەوەو بەیەکجار.

* شریتی پیشاندانی ڕاستەوخۆ Show Quick lunch

بەکلیك کردن لەناو چوارگۆشە بچووکەکەی بەردەمی لیستێك دروست دەبێت لەبەشی ڕاستی سەر Task bar کە پێی دەوترێت Show Quick lunch. ( وەك لەبەشەکانی پێشەوە باسمان کرد )

بەهۆیەوە ئەم فەرمانانە دەردەکەون:-

* بەهۆی ئەم فەرمانەوە هەموو پە نجەرە کراوەکانی سەر شاشەکە بچووك دەکرێتەوە.

*بە کلیك کردن لەسەری بەرنامەی Internet explorer دەکرێتەوە.

* بە کلیك کردنی بەرنامەی Media player چالاك دەبێت و دەکرێتەوە.



وە بەهۆی ئەم فەرمانی Quick lunch دوە ئەو چوار فەرمانەی سەرەوە دەشارێتەوە.

* ناوچەی چاودێری Notification area

ناوچەیەك لە Task bar –دا هەیە کە بە ڕووبەری چاودێری ناودەبرێت، بەم شێوەیە :-

وە لەم ناوچەیەدا لە Task bar چەند ئایکۆنێکی وەك: ( کاتژمێر، ئایکۆنی هەندێك بەرنامەی گرێدراو بە بیری کۆمپیوتەر ) لێیە، بە نموونە بەرنامەی دژە ڤایرەس Anti virus کە بەهۆیەوە ئەو ڤایرۆسانە دەگرێت و دەیان کوژێ واتە: دەیان سڕێتەوە کە لە بیری کۆمپیوتەردا جێگیربوون. دیارە ئەم ئایکۆنانە دەرناکەون و چوونە ناویەك و شاراوەن، بەڵام بە کلیك کردن لەسەر سەهمەکە دەردەکەون

بە دەرکەوتنیان سەهمەکە پێچەوانە دەبێتەوە، واتە: بە دووبارە کلیك کردنەوە دەشارێتەوەو دیار نامێنێت.



* هەڵبژاردنی Hide inactive icon

بە كلیك كردن لەناو چوارگۆشە بچووكەكەی بەردەمی چالاك دەبێت و بەم شێوەیەو بەهۆیەوە ئایكۆنەكانی بەشی لای ڕاستی Task bar دەردەكەون و دەكەونە بەرچاو وە بە پێچەوانەشەوە

بۆ زیاتر ڕوون بوونەوەو بینینی ئایكۆنەكان سەرنج بدە

## سەعات Show clock:

بە كلیك كردن لەسەر چوارگۆشە بچووكەكەی بەردەم ئەم فەرمانە چالاكی وەردەگرێت و لەبەشی لای ڕاستی Task bar دا دەردەكەوێت بەم شێوەیەی خوارەوە دەبینرێت




كە بەهۆیەوە دەتوانین كات و بەروار دەستكاری بكەین ئەگەر هەڵە بوو، یان دەتوانین بیگۆڕین بەو شێوەیەی كە دەمانەوێت:-

١- دووانە كلیك Double click لەسەر ئەو كاتژمێرە بكە كە دەكەوێتە بەشی ڕاستی Task bar كە بەهۆیەوە ئەم پە نجەرەیەت بۆ دەكرێتەوە




٢- لەبەشی كات Time دا وێنەی سەعاتێك دەبینی كە لە ژێریدا لاكێشەیەك هەیەو كاتەكەی تیا نووسراوە بە سەعات و دەقیقەو سانییەوە، كە بەهۆی دوو سەهمەكەیەوە دەتوانیت زیاد یان كەمی بكەیت و بەم شێوەیە

بۆ زیادكردنی ڕۆژیش (بەروار) دەتوانیت بەهەمان شێوەو بەهۆی ئەم هەنگاوانەوە بە ئە نجامی بگەیەنیت:-

١- لەبەشی تایبەت بە بەروار Date كلیك لەسەر سەهمە بچووكەكەی بەشی مانگەكان بكەو مانگێك دیاری بكە

٢- كلیك لەسەر ئەو مانگە بكە كە دیاری دەكەیت.

٣- كلیك لەسەر بەشی ساڵەكان بكە و گۆڕان لەساڵەكەدا بكە بەهۆی ئەو دوو سەهمە بچووكەوە كە لەسەریەتی، جا بەزیادكردنی ساڵەكە بێت یان كەم كردنی

لەدوای چاككردنی كاتژمێرو بەروار دەتوانیت كلیك لەسەر OK بكەیت بۆ داخستنەوەی پە نجەرەكەو، بەجێگەیاندن و چالاك كردنی كارەكەت، بەڵام بەر لە OK كردنیش دەتوانیت جگە لەبەشی Date and Time ی پە نجەرەكە، فەرمانی Time zone بەكاربهێنیت بۆ ڕێكخستنی كاتەكەت بەگوێرەی كاتی ئەو وڵاتەی كە دەتەوێت، دیارە بەگوێرەی كاتی ئەو وڵاتانەی كە لە ئامێرەكەدا هەیە، وە دەتوانیت سوودیش لە InternetTime وەربگریت بۆ ڕێكخستنی كاتەكەت بەهۆی ئینتەرنێتەوە.

## دووەم / Task Menu

تاسك مینیۆ واتە: لیستی تاسك كە بە لیستی دەستپێكردن Start menu –ش ناودەبرێت، بەكارهێنانی تایبەتی هەیە و بەشێكە لەو پە نجەرەیەی كە گۆڕانی Task bar –مان بەهۆیەوە ئە نجامدا، بەڵام بۆئەوەی بەكارهێنەر بە هەڵەدا نەچێت و مێشكی ماندوو نەبێت هەنگاوەكان دووبارە دەكەینەوە. ئەگەر چی زیادەیەو نەدەبوو بكرێت، بەڵام لەبەرئەوەی زنجیرە كتێبەكانم لەژێر دروشمی :( فێربوونی ئاسان... ببینەو... ئە نجامبدە!) دایە بۆیە ئەم كارەم دووبارە كردۆتەوە:–

١- لەسەر شوێنێكی Task bar كلیكی ڕاست بكە كە بەهۆیەوە ئەم لیستە دەكرێتەوە




٢- بچۆرە سەر فەرمانی Properties و كلیكی لەسەر بكە كە بەهۆیەوە ئەم پە نجەرەیە دەكرێتەوە

٣- كلیك لەسەر بەشی Start menu بكە كە فەرمانی دووەمی پە نجەرەكەیە لەژێر Title bar دا.




ئێستا دەتوانین بەهۆی ئەو هەڵبژاردنەی تیایدایە شێوەی یستی بەرنامەو پێكهاتەكانی كۆمپیوتەر دیاری بكەین، بەم شێوەیە:–

* ئەگەر كلیك لەناو بازنە بچووكەكەی بەردەم فەرمانی Start menu بكەین، ئەوا لیستەكەمان بەشێوەیەكی نوێ دەبێت كە كۆمپانیای مایكرۆ سۆفت ویستوویەتی بە ویندۆی ببەخشێت، كە بەمە لیستەكەمان دەبێتە دوو لیستی فەرمانی لە تەنیشت یەكدا كە شێوەیەكی جوانتر دەبەخشێ و كارئاسانییەكی باشتر دەكات.

* ئەگەر کلیك لەسەر فەرمانی Clasic start menu بکەیت و ئەمەی بژێریت. ئەوا لیستەکەمان بەشێوەی کۆن و کلاسیکی دەبێت و تەنها یەك لیست دەبێت کە هەموو فەرمانەکان لەخۆ دەگرێت و لە هەر فەرمانێکەوە کە فەرعی دیکەی لێ ببێتەوە بەهۆی سەهمی ماوسەکەوە کە دەیبەینە سەری لیستێکی تر دەکرێتەوە.

# لیستی تاسك

# Task menu

## * گەڕان:-

یەکێك لەو فەرمانانەی کە لە Task menu دا هەیە بریتییە لە فەرمانی گەڕان Search کە بە هۆیەوە دەتوانین بە شوێن مەلەفەکاندا بگەڕێین، بەم شێوەیە:-

١- کلیك لەسەر دوگمەی دەستپێکردن Start بکە کە دەکەوێتە سەر Task bar .

٢- پاشان بەهۆی سەهمی ماوسەکەوە بچۆرە سەر فەرمانی گەڕان Search کە تایبەتە بە گەڕانی مەلەفی ئامێرەکەت:-




لەو پەنجەرەیەی بۆت کرایەوەو لەبەشی خوارەوەی لای چەپدا وێنەی ( سەگێك ) دەبینی کە ناوی (Rover) ی بۆ دانراوە کە لەسەرو ئەم سەگە جوانەوە چەند بەشێك هەیە کە هەر بەشەو تایبەتمەندی خۆی هەیە بەم شێوەیە:-

* Picture, Music, Vidoes :- بەهۆی ئەم بەشەوە دەتوانی بۆ مۆسیقاو وێنەو گرتەکانی ڤیدیۆیی بگەڕێیت.

* Document:- دەتوانیت بەهۆیەوە بۆ دۆکیومێنتەکان بگەڕێین.

* All File and folder:- بەهۆیەوە هەموو فایل و فۆڵدەرەکانت بۆ دەدۆزرێتەوەو بە شوێنیدا دەگەڕێیت.

٣- کلیك لەسەر فەرمانی all file and folder بکە.

٤- ناوی ئەو فایلە بنووسە لەناو لاکێشەکەی ژێر نووسراوی All or part of the file دا، کە دەتەوێت بگەڕێی بۆی.

٥- شوێنی گەڕان دیاری بکە لەناو بەشی Look in دا کە دەتەوێت ئامێرەکەت بگەڕێت بە شوێنیدا.

بەگشتی ئەو بەشانەی ئامێرەکە سێرچ ( گەڕانی ) تیا دەکات ئەمانەیە :-

* Desk top :- ئەو فایل و فۆڵدەرانە دەکرێتەوە کە دەکەونە سەر ڕووی شاشە.

* My Document :- بۆ ئەو فایل و فۆڵدەرانە دەگەڕێت کە دەکەونە My Document ەوە.

* ( C:D ) :- بۆ ئەو مەلەفانە دەگەڕێت کە لە هاردی ( D,C ) دان.

* Floppy ٣,٥ :- بۆ ئەو فایلانە دەگەڕێت کە لەناو فلۆپییدان.

* My computer :- بۆ ئەو فایلانە دەگەڕێت کە لەناو My Computer دان.



سەرنج ـــــــــــــــــ :- ئەم وێنەیە هەموو بەشەکان و شێوەکانی گەڕان و خاڵەکانی سەرەوە ڕووندەکاتەوە.

٦- کلیك لەسەر دوگمەی Search بکە بۆئەوەی کارەکەت بۆ بەجێ بگەیەنێت.

دەتوانیت بەهۆی دووانە کلیکەوە Double click ئەو مەلەفانە بکەیتەوە کە بەهۆی سێرچەوە دۆزیوتەتەوە.

## کارپێکردنی فەرمانی ...Run :-

ئەم فەرمانە بۆ کۆمەڵێك مەبەستی جیاواز بەکاردەهێنرێت و جێگەی بایەخە لەبەرنامەی ویندۆس دا. چونکە کارئاسانیمان بۆ دەکات و هەندێك لە هەنگاوەکانی کارکردنمان بۆ کورت دەکاتەوە بۆیە بەکورتی ئاماژە بە چۆنیەتی کارکردن تیایدا چەند نموونەیەکی کارەکانیش ڕووندەکەینەوە، بەم شێوەیە :-

١- فەرمانی ...Run لە لیستی Task دا هەڵبژێرە بەهۆی کلیك کردن لەسەری



٢- ئەم پە نجەرەیەت بۆ دەكرێتەوە كە بەهۆیەوە دەتوانیت كارەكانمان بەجێ بگەیەنین بەم شێوەیە :-




یەكەم :-

ئەگەر بمانەوێت سیدیەك كارپێبكەین ئەوا لەناو لاكێشەی Open لە پە نجەرەكەی سەرەوەدا دەنووسین G:setup .

دووەم :-

ئەگەر بمانەوێت فایلە زیادەكان بسڕینەوە لەناو ئەم لاكێشەی -Open- دا ، دەنووسین Prefetch.

سێهەم :-

ئەگەر بمانەوێت ( Temp ) تێمپە زیادەكان بسڕینەوە بۆئەوەی كۆمپیوتەرەكەمان بۆ قورس نەكات لەناو لاكێشەكەدا دەنووسین %Temp% .

چوارەم :-

ئەگەر ویستت بەرنامەیەك بكەیتەوە بە نموونە بەرنامەی Word pad ئەوا لەناو لاكێشەكەدا ناوی بەرنامەكە بنووسە.

سەرنج: هەندێك بەرنامە ڕێگە پێدراو نییە بەم شێوەیە بەناوە ناسراوەكەیەوە بكرێتەوە.

پێنجەم :-

ئەگەر كۆمپیوتەرەكەت هێڵی ئینتەرنێتی لەسەرەوە دەتەوێت سایتێك بكەیتەوە لەناو لاكێشەی Open دا ناوی سایتەكە بنووسە.

شەشەم :-

بۆ كردنەوەی زۆر پە نجەرەی تر بەكاردەهێنرێت كە ئێمە لێرەدا ئاماژە بە هەندێكیان دەكەین :-

١- ( Command ) * كردنەوەی پە نجەرەی MS-DOS .

٢- ( calculator ) * كردنەوەی ئامێری ژماردن ( حاسیبە ).

٣- ( recent ) * كردنەوەو پیشاندانی ئەو پرۆگرام و بەرنامانەی پێشتر بەكارت هێناون.

٤- ( regedit ) * كردنەوەی پە نجەرەی ڕیجستر ( register ).

٥- ( Program ) * كردنەوەی بەرنامەی ما نجەر.

لەكۆتای هەر خالێكیاندا كلیك لەسەر okبكە یان پە نجە بنێ بە دووگمەی ئینتەری سەر ڕووی كیبۆردەكەدا بۆ بەئە نجام گەیاندنی كارەكەت.

## بەشەكانی دیكەی Task bar

بێگومان تا ئێستا بە تەواوی باسی بەشەكانی task menu نەكراوەو بە تەواوی و وردیش باسی ویندۆ نەكراوە. چونكە ئەو كارە كاتێكی زۆرترو سەرچاوەی زیاتری دەوێت و بەمەش قەبارەی كتێبەكە زیاتر دەبێت و ناچار دەبین بە نرخێكی زیاتر بیفرۆشین، بەلام بەڵێن دەدەم كە وردەكارییەكان هەلگرم بۆ كاتێكی دیكە بۆیە لێرەدا بەكورتی ئاماژە بەو بەشانە دەدەم كە لە لیستی Task دان و پێویستە بیانزانین :-

يەكەم:-

بۆ كردنەوەی بەرنامەكانی ئۆفیس كە بە دابەزاندنیان دەبنە بەشێك لەم لیستە ئەم هەنگاوانە هەڵگرە:-

١- بۆ وۆرد:-

Start > all Program > Microsoft office > MS. Word

٢- بۆ ئێكسڵ:- Start > all Program > Microsoft office >Excel

٣- بۆ پاوەرپۆینت:- Start > all Program > Microsoft office > PowerPoint

بەو ڕێگەیە بەرنامەكەت بۆ دەكرێتەوە

٤- بۆ ئەكسێس:- Start > all Program > Microsoft office > Access

بەم ڕێگەیە بەرنامە دەكرێتەوە

٥- بۆ فرۆنت پەیج:- Start > all Program > Microsoft office > FrontPage

بەم ڕێگەیە بەرنامەكەت بۆ دەكرێتەوە

٦- بۆ پەبلیشەر:- Start > all Program > Microsoft office > Publisher

بەم ڕێگەی بەرنامەكەت بۆ دەكرێتەوە

٧- بۆ ئینفۆ پاس:- Start > all Program > Microsoft office > Info Path

بەم شێوەیە بەرنامەكەت بۆ دەكرێتەوە

٨- بۆ ئاوت لووك:- Start > all Program > Microsoft office > Outlook

بەم ڕێگەیە بەرنامەكەت بۆ دەكرێتەوە




دووەم:-

بۆ كردنەوەی My Document

Start > My Document

سێهەم:-

بۆ كردنەوەی My Computer

Start > My Computer

چوارەم:-

بۆ کردنەوەی My Music

Start > My Music

پێنجەم:-

بۆ کردنەوەی لیستی یارمەتی.

Start > help and support

شەشەم:- بۆ کردنەوەی بەشی وێنە.

Start > My Picture




حەوتەم:-

بۆ کردنەوەی پەنجەرەی دەست بەسەراگرتنی فەرمانەکان.

Start > Control Panel



# بەشی نۆهەم / تـابلۆی دەست بەسەرداگرتن

## Control Panel

فایلی دەست بەسەرداگرتن Control Panel یەکێکە لە گرنگترین بەرنامەو بەشەکانی ویندۆس Windows$^{XP}$ ، کە دەتوانین بەهۆیەوە دەست بەسەر زۆربەی فەرمان و بەشەکاندا بگرین بۆ نموونە زیادکردنی فۆنت، یان دەستکاری کردنی خێرای سەهمی ماوسەکە و پرنتەرو کارتی دەنگ و گۆڕانی ڕەنگی ناوچەی شاشەو زۆر فەرمانی دیکە. کە لێرەداو لەم بەشەی کتێبەکەماندا زۆر بە کورتی ئاماژە بە هەندێکیان دەکەین و ڕوونیان دەکەینەوە، بەڵام ووردەکارییەکانی فایلی دەست بەسەرداگرتن بەتایبەتی و ویندۆس بەگشتی هەڵدەگرین بۆ کتێب و شوێنێکی تر ئەگەر خوای گەورە تەمەن بدات.

بۆ کردنەوەی تابلۆی دەست بەسەرداگرتنی فەرمانەکان و گۆڕان تیایاندا ئەم هەنگاوانە دەگرینە بەر:-

١- فەرمانی کۆنترۆڵ پانێڵ Control Panel لە لیستی Task دا کلیك بکە:-

Start > Control Panel

ڕەنگە پەنجەرەی دەست بەسـەرداگرتنی فەرمانـەکانت بـە شێوەیەکی ئاسـای بـۆ نەکرێتـەوەو پێکهاتـەکانی نـەبینیت بۆیـە خـاڵی ٢بەئە نجامبگەیەنە.

٢- کلیك لەسـەر سویچی گـۆڕینی پیشـاندانی پەنجەرەکە Switch to classic view بکـە بـۆ پیشـاندانی تـەواوی ئامرازەکـان (ئایکۆنەکان) لەناو تـابلۆی دەست بەسەرداگرتن، بەم شێوەیە




ئێستاو دوای کردنەوەی Control Panel باس لە چەند حاڵەتێك دەکـەین، کـە بەشـێوەیەکی گـشتی گـۆڕان و دەست بەسـەرداگرتنی کارەکانە:-

یەکەم:- Mouse

١- پێچەوانە کردنەوەی کلیك:-

لە ئەزەلەوە هەندێك مرۆڤـ هەن کە دەستی ڕاستیان چالاك نییەو زۆر بە کەمی بەکاری دەهێنن و زیـاتر چـەپ بـەکاردەهێنن، کـە بـەم مرۆڤانە دەڵێن: چە پە، کاتێك ئەم مرۆڤانە ماوس دەگرن بەدەستەوە کلیکی ڕاست و چەپ پێچەوانەی ئەو مرۆڤە دەبێت کە ڕاستەیەوە بە

دەستی ڕاست ماوس دەگرێت، جا بۆ نەهێشتنی ئەم کێشەیە کۆمپانیای مایکرۆسۆفت ئەو تایبەتمەندییەی بە ویندۆس بەخشیوە کە بتوانیت کلیکی ماوسەکە پێچەوانە بکەینەوە بۆ کلیك کردن، بەم شێوەیە :-

* لەناو Control Panel دا دووانە کلیك Double click لەسەر هێمای ماوسەکە بکە :-




کە بەهۆی ئەم دووانە کلیکەوە ئەم پەنجەرەیەی سەرەوەت بۆ دەکرێتەوە :-

کلیك لەناو چوارگۆشە بچووکەکەی بەردەم Switch Primary and secondary buttons بکە بۆ چالاککردنیفەرمانەکەو ئامادەکردنی ماوسەکە بۆ کەسانی چەپلەر.

* کلیك لەسەر OK بکە بۆ بەجێگەیاندنی فەرمانەکەو داخستنەوەی پەنجەرەکە. بەمەش فەرمانی کلیکی ڕاست و چەپ پێچەوانە دەبنەوە.

٢- دیاریکردنی خێرای دووانە کلیك Double click دەتوانین بەهۆی Mouse ی Control Panel دەست بەسەر خێرایی کلیك دا بگرین، بەهۆی بەجێگەیاندنی ئەم هەنگاوانەوە :-

* دووانە کلیك Double click لەسەر هێمای ماوسەکە بکە لەناو ( Control Panel ) دا ( وەك لەسەرەوە کردمان )

بەهۆی ئەم دووانە کلیکەوە ئەم پەنجەرەیەت بۆ دەکرێتەوە

* کلیك لەسەر هێمای زیاد و کەم کردنی خێرایی Speed بکەو بەرەو لای Slow بیهێنە

* کلیك لەسەر OK بکە بۆ داخستنەوەی پەنجەرەکەو بەجێگەیاندنی کارەکە کە کەمکردنەوەی خێرایی بوو، وە دەتوانی بەرەو لای Fast بیبەیت و بەمەش خێراییەکەی زیاد دەکات.

٣- گۆڕینی خێرایی سەهمی ماوس

وەك چۆن توانیمان خێرایی دووانە کلیك کەمبکەینەوە، یان زیادی بکەین، ئاواش دەتوانین خێرایی جووڵەی سەهمی ماوسەکە دیاری بکەین کە چۆن بێت، زۆر خێرا بێت، یان ناوەند، وەیان کەم، بەهۆی ئەم هەنگاوانەی خوارەوە :-

* دووانە کلیك Double click لەسەر وێنەی ماوسەکە بکە لە Control Panel دا :- ( وەك لەسەرەوە ئەنجامماندا )

* کلیك لەسەر بەشی Pointer Option بکە لەبەشی سەرەوەی پەنجەرەکە :-

* کلیك لەسەر هێمای دیاریکردنی خێرایی ماوس Pointer Speed بکەلە بەشی سەرەوە پەنجەرەی ماوسدا واتە لەژێر تایتڵ باری پەنجەرەکەدا و بە ئارەزووی خۆت خێرایی جووڵاندنی زیاد یان کەم بکە، ئەگەر ویستت زیادی بکەیت بە ئاراستەی خێرایی Fast بیجووڵێنە وە بە پێچەوانەشەوە بە ئاراستەی Slow .

# کتێبە چاپکراوەکانی نووسەر












## دووەم:- گۆڕینی ئامادەکردنی ناوچەیی:-

بۆ هەموو وولاتێك لە وولاتەکانی جیهان هەندێك دانراوی هەرێمی تایبەت هەیە، بە نموونە لە وولاتە عەرەبی یەکاندا بەروار بەگشتی بەم شێوەیە دەنووسرێت: ڕۆژ/ مانگ/ ساڵ کەچی لە وولاتێکی وەك ئەمریکادا بەم شێوەیە دەنووسرێت: مانگ/ ڕۆژ/ ساڵ. بۆیە بۆ بەجێگەیاندنی ئەم جۆرە کارانە ئەم هەنگاوانە بگرە بەر:-

* دووانە کلیك Double click لەسەر دوگمەی Regional Setting بکە کە دەکەوێتە ناو Control Panel:-




بەهۆیەوە ئەم پە نجەرەیەمان بۆ دەکرێتەوە:-

دەتوانین لەم پە نجەرەیەی پێشەوەدا هەڵبژاردنی جیاوازی ناوچەیی دابنرێت لە بەروارو کات و هێمای کارو شێوەی ژمارەیی.

* کلیك لەسەر هێمای سەهمی دیاریکردنی ناوی وولاتەکان بکە و ناوی ولات هەڵبژێرە،وەك ئێمە لە وێنەکەی سەرەوەدا ناوی Arabic(Iraq)مان هەڵبژاردووە.

* کلیك لەسەر ناوی ئەو وولاتە بکە کە دەتەوێت و دەتوانیت بەهۆی سکرۆڵی سەرەوە کارئاسانی بکەیت.

* کلیك لەسەر دوگمەی OK بکە بۆ بەجێگەیاندنی فەرمانەکەو داخستنەوەی پە نجەرەکە.

## سێهەم:- دابەزاندن و سڕینەوەی بەرنامەکە:-

دەتوانین بەهۆی ئەم دوگمەیەی Control Panel دەست بەسەر دابەزاندنی بەرنامەو سڕینەوەی بەرنامەدا بگرین بەگوێرەی خواست و ویستی خۆت و بەگوێرەی پێویستی کارکردنت، بەهۆی ئەم هەنگاوانەی خوارەوە:-

* دووانە کلیك Double click لەسەر هێمای Add/ remove Program بکە لەناو Control panel:-




لە ئە نجامدا ئەم پە نجەرەیەت بۆ دەکرێتەوە:-

ئەم پەنجەرەیە دوو فەرمانی گرنگ لەخۆ دەگرێت كە بەكورتی باسیان دەكەین:-

## Change or remove Program (a)

دەگونجێت بەهۆی ئەم فەرمانەوە بڕیار لەسەر سڕینەوەی بەرنامەیەك بدەیت كە بەشێوەی Change / remove ئەم كـارە دەكرێـت و بە كلیك كردن لەسەر ئەو بەرنامەیەی دەمانەوێت گۆڕانی تیا بە ئە نجام بدەین یان بیسڕینەوە ئەمكارە بەم شـێوەیە ئـە نجام دەدێـت:- ئەگەر ویستمان بیسڕینەوە ئەوا كلیك لەسەر بەرنامەكە دەكـەین و پاشـان دێینەسـەر بەشـی remove و كلیكـی لەسـەر دەكـەین، بـەم شێوەیە بەرنامەكە دەسڕێتەوە.- ئەگەر بمانەوێت گۆڕان ئە نجام بدەین ئەوا كلیك لەسەر فەرمانی Change دەكەین.

## Add New Program (b)

دەگونجێت لەرێگەی ئەم هەڵبژاردنەوە هەڵبستین بە دابەزاندنی بەرنامەیەكی نوێ، سەرەتـا بەهۆی خستنە نـاوی فلۆپییەكـەوە (FD) Floppy disk بۆ ناو فلۆپی درایڤەكە، یان بەهۆی دیسكێكی گوشراو (CD) Compact disk كە ئەو بەرنامەیـەی تێـدا بێـت كـە دەمانەوێت دایبەزێنین:-@ لە كۆتـایی كارەكانـدا كلیك لەسەر دوگمەی Close بكە بۆ داخستنەوەی پە نجەرەكە.

* سەرنج:-

جگە لەو سێ خانەی لە پێشەوە بـاسمان كرد Control Panel بەشی زۆر دیكـەی تێدایـە وەك: ( Key board- Mail- Game- Controllers- Power Option- Phone and Modern…- Network Connections- Scheduled-...)

بەڵام ئێمە لێرەدا باسی ئەو سێ بەشەمان زۆر بە گرنگ و پێویست زانی لەگەڵ ئەوەشدا بەڵێن دەدەم كە ئەگەر خوای گەورە تەمەن بدات و تەندروسـتیم بـاشـو بـێ گرفت بێـت لـە كتێبێكـی دیكـەدا زۆر زیـاترو وینـدۆس شـی بكەمـەوەو بـچمە قـوڵایی و ووردەكـاریو نهێنـی یەكانیەوە، یان لە چاپی دووەمی ئەم كتێبەدا، پشت بەخودا.

............................................................................................................................................................

# بەشی دەهەم / فایل و ... فۆڵدەر

## File and Folders

Windows Explorer

دەتوانین سوود لە وینـدۆس ئـێكس پـلۆرەر وەربگـرین بـۆ پیـشاندانی فایلـەكان فۆڵـدەرەكانی نـاو ئـامێری كۆمپیوتەرەكـەمان كـاركردن لەسەریان، بۆ كردنەوەی ئەم بەشەو چالاككردنی ئەم هەنگاوانە بگرە بەر:-

١- كلیك لەسەر دوگمەی Star بكە.

٢- بچۆرە سەر بەشی هـەموو بەرنامـەكان All programs لـەو لیـستەدا كـە بۆتكرایـەوەو پاشـان بـچۆرە سـەر Accessories كـە بەهۆیەوە لیستێكی دیكەت بۆ دەكرێتەوە كە بەرنامە پاشكۆكانی بەرنامەی ویندۆسی تێدایە:-

٣- بەشی Windows Explorer هەڵبژێرەو كلیكی لەسەر بكە.



@سەرنجـــــــــ١ــــــــــــ:-

دەتوانیت بەڕێگایەکی ئاسانترو کورت تر ئەم بەشە بکەیتەوە ئەویش بە کلیکی ڕاست Right click کردن لەسەر دوگمەی دەستپێکردن Star و پاشان کلیك لەسەر Explorer لەو لیستەی کە بۆت دەکرێتەوە.

ئەو پە نجەرەیەی Explorer دەکرێتەوە دابەش دەبێت بۆ دوو بەشی سەرەکی، کە لەبەشی لای چە پدا ناوی هاردەکان و فۆڵدەرەکان و بەشەکانی دیکەی تێدایەو بە کلیك کردنیان لەبەشی لای ڕاستدا ناوەڕۆکەکانیان دەکرێتەوەو دەبینرێن.

@سەرنجـــــــــ٢ــــــــــــ:-

لە تەنیشت هێمای هەموو فۆڵدەرێکەوە لە بەشی چە پی پە نجەرەی Explorer هێمای [+] هەیە کە هێمای ئەوەیە ئەم بەشە بەشی دیکەی تێدایەو دەتوانرێ بە کلیك کردن لەسەری بیکەینەوە.




## دروستکردنی فۆڵدەر

دروستکردنی فۆڵدەر بۆئەوەی ژمارەیەك فایلی تیا جێبکەینەوە کارێکی پێویستەو لەزووربەی بەشەکانی کۆمپیوتەردا بە هاردو دیسك تۆپیشەوە ئەم کارە بێ جیاوازی دەکرێت، بۆیە نموونەیەك لەسەر Desk top دەهێنینەوەو ڕوونی دەکەینەوەو نموونەیەکیش لەسەر یەکێك لە هاردەکان:-

دروستکردنی فوڵدەر لە یەکێك لە هاردەکاندا.

بۆ دروستکردنی فۆڵدەر لە یەکێك لە هاردەکاندا ئەم خاڵانە بەجێ بگەیەنە:-

١- ئەو هاردەی دەتەوێ فۆڵدەرەکەی تیا دروست بکەیت بیکەرەوە. بۆ نموونە ئێمە دەمانەوێت لە هاردی (D:\) دا دروستی بکەین بۆیە ئەو بەشە دەکەینەوە بەم شێوەیە:-

* دووانە کلیك لەسەر My Computer بکە کە دەکەوێتە سەر ڕووی شاشەکە، یان کلیکی ڕاست و پاشان کلیك لەسەر Open بکە.



* My Computer کرایەوە، دیسان دووانە کلیك Double click لەسەر هاردی ( D ) بکە، دەبینی هاردی ( D ) دەکرێتەوە.



٢-کلیکی ڕاست لەناو پەنجەرەی Dدا بکەو پاشان سەهمی ماوسەکە ببەرەسەر بەشی newلەو لیستەی کەبەهۆی کلیکی ڕاستەکەوە بۆت کرایەوەو،دوواتریش سەهمی ماوسەکەببەرەسەر folderو کلیکی لەسەر بکە،بەمەش فولدەرێکی نوێت بۆ دروست دەبێت.

سەرنج ــــــــــ١ــــــــــ:-

کردنەوەی فولدەریش وەك کردنەوەی هاردەکان ومای کۆمپیوتەر و بەشەکانی بەهۆی دووانە کلیك،یان کلیکی ڕاست و پاشان کلیککردن لەسەر openدەکرێتەوە،یان بە یەکلیك و پاشان پە نجانان بەدووگمەی ئینتەری سەر کیبۆرددا،یان بەیەك کلیك لەبارێکدا ئەگەر خۆمان ئەو تایبە تمەندییەمان دابێت بە فولدەرەکان.

سەرنج ــــــــــ٢ــــــــــ:-

سڕینەوەی فولدەریش وەك سڕینەوەی هەربەشێکی دی بە چەند ڕێگەیەك دەبێت وەك باسکراون،یان بە کلیك کردن لەسەری و پاشان پە نجەنان بە دووگمەی deleteسەر ڕووی کیبۆردەکەدا،و دواتر کلیك کردن لەسەر yesیان پە نجەنان بە دووگمەی enterی سەر ڕووی کیبۆردەکەدا.

یان بەهۆی deleteلیستەکانەوە.

سەرنج ــــــــــ٣ــــــــــ:-

خەزنکردن و هەڵگرتن و پاراستنی بابەت لە ناو فولدەردا وەك خەزنکردن و پاراستن و هەڵگرتنی بابەت وایە لەهاردەکاندا ،یان لە فلۆپی دا،وەهەروەها.....

## ئەم بەرهەمانە لەژێرچا پدان

## *چۆن فێری ئینتەرنێت ببم......؟؟

## *وشەی زێڕین ...زێڕینە وشە

## *مایکرۆسۆفت ئۆفیس ٢٠٠٦

# کتێبەکانی نووسەر

*** زانیاری تەکنیکی :**

**١- ڕێبەری ماڵپەڕە کوردی یەکان.**

**٢- فۆتۆشۆپ سی ئێس – هەشت.**

**بۆ ئاستی سەرەتایی و ناوەندی.**

**٣- چۆن فێری ئینتەرنێت بم ... !!**

**٤- زانیاری تەکنیکی**

**٥- ویندۆس ئێکس پی.**

**٦- فۆتۆشۆپ سی ئێس – هەشت و نۆ.**

**بۆ ئاستی سەرەتایی، ناوەندی، پێشکەوتوان.**

**٧- زاراوە زانی کۆمپیوتەر.** Computer Terminology

**٨- ڕێبەری سەتەلایت.**

**٩- مایکرۆسۆفت پەبلێشەر.**

**١٠-** Chatting **بەشی ١ و ٢.**

**پاڵتاک ... یاهوو ماسنجەر ....مسن ماسنجەر**

**١١- مایکرۆسۆفت ئۆفیس بەشی ١ و ٢.**

**١٢- فرۆنت پەیج.**

**١٣- ئێکسڵ. بۆ ئاستی سەرەتایی و ناوەندی.**

**١٤-فێربوونی بەکارهێنانی تۆڕی ئینتەرنێت.**

**١٥-فێربوونی بەکارهێنانی کۆمپیوتەر.**

**١٦-هارد وێر و...سیستەمی کۆمپیوتەر**

**١٧-مایکرۆ سۆفت ئۆفیس ٢٠٠٣**

**١٨-کتێبی تر ...کەسەرجەمیان ٣٥کتێبە....!!**

**چەند دانە کتێبی دیکە لە بەردەستدایە گەر خوای گەورە تەمەن بدات و گرفتی تەندروستی و ماد یم نەیەتە ڕێگە.**

*** کتێبە زانستی و ڕۆشنبیری و ئەدەبی یەکان.**

**١- دکتۆرای ئەوین ... دیوانە شیعر.**

**٢- بستێ لەملای بەهەشتەوە، نا بستێ لەملای دۆزەخەوە... چیرۆک.**

**٣- لەرێ ... ناونامەی کوردی ... فەرهەنگ.**

**٤- هێمن ... فەرهەنگی پزیشکی – ئینگلیزی کوردی.**

**٥- لاو ... و ژیانی سێکسی ... ووتارو لێکۆڵینەوەی زانستی و پزیشکی و کۆمەلایەتی.**

**٦- ووشە ئاڵتوونی یەکان ...** Golden Words.

**زیاتر لە هەزار ووتەی فەیلەسوف و زاناو بیریارو ئەدیبان.**

**٧- ساتێك پێبکەنە ... کۆمەڵێك نووکتەی کۆکراوە.**

**٨- دڵی شاعیر ... دیوانە شیعر.**

# شۆرتکەتی ویندۆزو بەکارهێنانەکانی

General keyboard shortcuts

| Press پە نجە دابگرە لەسەر | To بەکاردێت بۆ |
|---|---|
| CTRL+C | Copy. |
| CTRL+X | Cut. |
| CTRL+V | Paste. |
| CTRL+Z | Undo. |
| DELETE | Delete. |
| SHIFT+DELETE | Delete selected item permanently without placing the item in the Recycle Bin. |
| CTRL while dragging an item | Copy selected item. |
| CTRL+SHIFT while dragging an item | Create shortcut to selected item. |
| F٢ | Rename selected item. |
| CTRL+RIGHT ARROW | Move the insertion point to the beginning of the next word. |
| CTRL+LEFT ARROW | Move the insertion point to the beginning of the previous word. |
| CTRL+DOWN ARROW | Move the insertion point to the beginning of the next paragraph. |
| CTRL+UP ARROW | Move the insertion point to the beginning of the previous paragraph. |
| CTRL+SHIFT with any of the arrow keys | Highlight a block of text. |
| SHIFT with any of the arrow keys | Select more than one item in a window or on the desktop, or select text within a document. |
| CTRL+A | Select all. |
| F٣ | Search for a file or folder. |
| ALT+ENTER | View properties for the selected item. |
| ALT+F٤ | Close the active item, or quit the active program. |
| ALT+Enter | Displays the properties of the selected object. |
| ALT+SPACEBAR | Opens the shortcut menu for the active window. |
| CTRL+F٤ | Close the active document in programs that allow you to have multiple documents open simultaneously. |
| ALT+TAB | Switch between open items. |
| ALT+ESC | Cycle through items in the order they were opened. |
| F٦ | Cycle through screen elements in a window or on the desktop. |
| F٤ | Display the Address bar list in My Computer or Windows Explorer. |

| | |
|---|---|
| SHIFT+F١٠ | Display the shortcut menu for the selected item. |
| ALT+SPACEBAR | Display the System menu for the active window. |
| CTRL+ESC | Display the **Start** menu. |
| ALT+Underlined letter in a menu name | Display the corresponding menu. |
| Underlined letter in a command name on an open menu | Carry out the corresponding command. |
| F١٠ | Activate the menu bar in the active program. |
| RIGHT ARROW | Open the next menu to the right, or open a submenu. |
| LEFT ARROW | Open the next menu to the left, or close a submenu. |
| F٥ | Refresh the active window. |
| BACKSPACE | View the folder one level up in My Computer or Windows Explorer. |
| ESC | Cancel the current task. |
| SHIFT when you insert a CD into the CD-ROM drive | Prevent the CD from automatically playing. |

⊟Dialog box keyboard shortcuts

| **Press** | **To** |
|---|---|
| CTRL+TAB | Move forward through tabs. |
| CTRL+SHIFT+TAB | Move backward through tabs. |
| TAB | Move forward through options. |
| SHIFT+TAB | Move backward through options. |
| ALT+Underlined letter | Carry out the corresponding command or select the corresponding option. |
| ENTER | Carry out the command for the active option or button. |
| SPACEBAR | Select or clear the check box if the active option is a check box. |
| Arrow keys | Select a button if the active option is a group of option buttons. |
| F١ | Display Help. |
| F٤ | Display the items in the active list. |
| BACKSPACE | Open a folder one level up if a folder is selected in the **Save As** or **Open** dialog box. |

چاوەڕێبن...

بەمزووانە

وشەی زێڕین...زێڕینە وشە

١٥٠٠وتەی زاناو فەیلەسوف و عاریف و کەسەناسراوەکانی دوونیایە

حەوتەمین کتێبی نووسەرەو لەژێر چاپدایە

## Natural keyboard shortcuts

| Press | To |
|---|---|
| | Display or hide the **Start** menu. |
| +BREAK | Display the **System Properties** dialog box. |
| +D | Show the desktop. |
| +M | Minimize all windows. |
| +Shift+M | Restores minimized windows. |
| +E | Open My Computer. |
| +F | Search for a file or folder. |
| CTRL+ +F | Search for computers. |
| +F١ | Display Windows Help. |
| + L | Lock your computer if you are connected to a network domain, or switch users if you are not connected to a network domain. |
| +R | Open the **Run** dialog box. |
| | Display the shortcut menu for the selected item. |
| +U | Open Utility Manager. |

### ⊟Accessibility keyboard shortcuts

| Press | To |
|---|---|
| Right SHIFT for eight seconds | Switch FilterKeys on and off. |
| Left ALT +left SHIFT +PRINT SCREEN | Switch High Contrast on and off. |
| Left ALT +left SHIFT +NUM LOCK | Switch MouseKeys on and off. |
| SHIFT five times | Switch StickyKeys on and off. |
| NUM LOCK for five seconds | Switch ToggleKeys on and off. |
| +U | Open Utility Manager. |

### ⊟Windows Explorer keyboard shortcuts

| Press | To |
|---|---|
| END | Display the bottom of the active window. |
| HOME | Display the top of the active window. |
| NUM LOCK+ASTERISK on numeric keypad (*) | Display all subfolders under the selected folder. |
| NUM LOCK+PLUS SIGN on numeric keypad (+) | Display the contents of the selected folder. |
| NUM LOCK+MINUS SIGN on numeric keypad (-) | Collapse the selected folder. |
| LEFT ARROW | Collapse current selection if it's expanded, or select parent folder. |
| RIGHT ARROW | Display current selection if it's collapsed, or select first subfolder. |